ستیڤان شەمزینی



# خۆشەویستی لە سەردەمی شێرپەنجەدا



چاپی دووەم

## پێشەکی

ئەم کتێبە بریتییە لە خۆدواندنێك «مۆنۆلۆگ» لە بارەی زۆر پرسی لێك جیاواز، هەر لە خۆشەویستی و سێکس و جەستەوە بیگرە تاکو مەرگ و نامۆبوون و رەخنەگرتن لە مۆدێرنێتە و سیستمی کاپیتالیزم، ناوەڕۆکی هەر هەموویان لە دواجاردا بەستراوەتەوە بە چەمکی خۆشەویستییەوە، هەر بۆیە ناوی کتێبەکەشمان نا «خۆشەویستی لە سەردەمی شێرپەنجەدا» هەرچەندە ئەم ناونیشانە، خواستنە لە ناوی رۆمانی «خۆشەویستی لە زەمەنی کولێرا»ی گابریل گارسیا مارکیز، ئەمەش کارێکی رێپێدراوە، تەنانەت کەسێکی وەك «لینین» ناوی یەکێك لە کتێبە سیاسییەکانی خۆی «چی بکرێت؟» لە ناوی رۆمانێکی ناسراوی رووسییەوە وەرگرتبوو، بەڵام ئێمە دەقاودەق ناوەکەمان وەرنەگرتووە، بەڵکو «شێرپەنجە»مان خستۆتە بری «کولێرا»، ئەگەرچی هەردوو ناوەکە ناوی نەخۆشین، بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە

ناوەڕۆکێکی لێکچوویان نییە، هەڵبەتە وشەی «شێرپەنجە» لای من دوو دەلالەتی بنەڕەتی هەیە، یەکەمیان ئەوەیە ئەم کتێبە کە لە بنەماوە چەند پەرەگرافێکی پەرش و بڵاوبووە، لە سەروەختی ململانێ لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجە نوسراوە و پاکنووسکراوە، دووەمیان، پێموایە زەمەنەکە چەرخی شێرپەنجەیە بۆ خۆشەویستی و ئەو هیومانیزمەی من داکۆکی لێ دەکەم و کردوومە بە درێژایی تەمەن، دەتوانم بڵێم دۆزی ژیانم دۆزی هیومانیزم و بەرگریکردن بووە لە مرۆڤی رووت. ئەوەی لەسەروو هەموو شتێکەوە بۆم گرنگە مرۆڤە، هەر شتێکی تر لە خواروو ئەمەوە دەبینم.

رەنگبێ شێوازی مۆنۆلۆگەکان بۆ خوێنەران سەیر بن، یان رەنگە بڵێن باشتر بوو لە فۆرمی توێژینەوەدا بیرۆکەکان تەرح بکرابان، ئەمانە هەموو راستن، بەڵام لەوانە راستتر لەوەدایە، ئەم مۆنۆلۆگانە شەڕێکە لەناو ئەندێشەمدا بەرپابووە و تا کۆتایش ئەم جەنگە بەردەوامیی دەبێت. لانیکەم مرۆڤێك سەروکاری لەگەڵ خوێندنەوە و نووسیندا هەبێت، لە باری سایکۆلۆژییەوە جێگیر نییە، بەو پێیەی هەمیشە لە شەڕێکی بێ پسانەوەدایە لەگەڵ بیر و پارادۆکسەکانی ناو هزرینی، ئەمە حاڵەتێکی سروشتییە، لە سۆنگەی ئەوەی دڵەڕاوکێ هەمیشە ماڵمانی داهێنانە و هەوێنی پێشکەوتنی ژیاریشە، تەنانەت ئەدگارێکی هەمیشەیی مرۆڤی شارستانییە. ئەو دیالۆگەی نێوان «من» و «خۆم» تەنیا ئاوازسەندنەوە نییە بۆ یەکتر، نەریتی بەندبێژەکانیش پەیڕەو ناکەن تاکوو بەندی

یەکتر تەواو بکەن، بەڵکو لە بارێکی مۆلەق و ناجێگیردا قسە دەکەن، تەبا نین لەگەڵ یەکتر لەسەر زۆر شت، بەڵام دواجار ئەمە ئەندێشەی مرۆڤە، پێموایە ئەندێشەی هەر مرۆڤێکی تریش پڕپەتی لە هاودژیی، لەوانەیە جیاوازییەکەم لەوەدا بێت تواناى گوزارشتکردنم هەیە لەو پارادۆکسە. بۆی هەیە «خۆم» لێرەدا هەر «من»ە فرۆیدییەکە بێت، هەمیشە بکەوێتە بەرداشی شەڕی دەستەویەخەی «ئەو» و «منی باڵا»وە. «من»یش لەم تێکستەدا هەمیشە «ئەو»ی سەرکێشە، هیچ کات رۆڵی «منی باڵا» ناگێڕێت، بگرە لەم تێکستەدا «منی باڵا» بوونی نییە، ئەوەی هەیە دیالۆگی «من» و «ئەو»ە، ئەمەش وەك وتم بە پێی تیۆری دەروونشیکاریی فرۆید.

حەزیش ناکەم باس لە ناوەڕۆکی کتێبە بکەم، یان کورتی بکەمەوە لەم پێشەکییەدا بۆ خوێنەر، ئەگەر وا بکەم پێویست ناکات خوێنەر خۆی ماندوو بکات و تەواوی کتێبەکە بخوێنێتەوە. ئەوەی گرنگە لام ئاماژەی بۆ بکەم، روونکردنەوەی هەندێك تەمومژە لە دەوروبەری مۆنۆلۆگەکان. هەندێك جار «من و خۆم» هێندە دوور لە یەکتر دەئاخڤن، وەك ئەوەیە دوو کەسی جیاواز قسە بکەن، بەڵام لە راستییدا قسەکەری یەکەم و کۆتایی هەر نووسەری ئەم کتێبە خۆیەتی، لەوە زیاتر روانینی هیچ کەسێکی تر بەشدار نەبووە لە گەڵاڵەکردنی ئەم مۆنۆلۆگانەدا، هەر بۆیە چارم نەبوو، دەبوایە ئەم جەلەحانێیە هەر لە نێوان «من و خۆم»دا

رووبــدات، زۆرجــار بیرۆکــەی ئــەوە بــە خــەیاڵـمدا گــوزەری دەکرد، ناوێك «ناوی کەسێك» لە بەرامبەر «من»دا دابنێم، بەڵام هەر زوو ژیوان بوومەوە، بەوەی نەکا سەر لە خوێنەر بشێوێنێت و پێیوابێت نووسەر لەگەڵ کەسێکی تردا دیالۆگی کردووە و ئەم بەرهەمە لە دایك بووە.

کۆتا جار، ئەم پرسیارەش لە خۆم دەکەم، ئایا کتێبێکی وەها پێویست بوو بۆ خوێنەری کورد؟. وەڵامێکی کۆنکرێتم لا نییە، دەمێك لەبەرخۆمەوە دەڵێم ئەم کتێبە وەك هەموو دەنگەکانی بۆشایی ئاسمان تەنها وەك دەنگێك لەناو ئەو هەموو هەراوهوریایەدا دەمێنێتەوە و کەس گوێی لێ نابێت، دەمێکی تر دەڵێم خوێنەرێك هەیە بیدۆزێتەوە و بە بایەخەوە بیخوێنێتەوە، لەناو هەموو ئەو ڕاڕاییانەشدا بڕیاری چاپکردنیم داوە، ئیدی هەر لە چاپ هاتە دەرەوە، پەیوەندییم لەگەڵ ئەم کتێبە دەپچڕێت و تاکە شتێك بمبەستێتەوە پێوەی ناوی خۆمە لەسەر بەرگی کتێبەکە، هەروەك ئەلبێر کامۆ لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانیدا وتبووی «کتێبەکانی خۆم ناخوێنمەوە، دەمەوێت کارێکی تر، ئەنجام بدەم، یان ڕوونتر بڵێم دەمەوێت بەرهەمێکی تر بنووسم». ئەم پرەنسیپەش لە سەرەتاوە باوەڕم پێی هێناوە و جێبەجێم کردووە، هەر بۆیە لە ئێستادا وەك بێگارییەك پێشەکی ئەم کتێبە دەنووسم، بەهۆی ئەوەی خۆم تەرخان کردووە بۆ نووسینی کۆمەڵێك بەرهەمی تر. لەیەك کاتدا کار لەسەر سێ کتێب دەکەم، بۆیە کاتم بەدەستەوە نابێت تا جارێکی تر کتێبەکانم بخوێنمەوە.

نایشارمەوە هۆکارێکی تریش هەیە، ترسم هەیە لە کاتی دووبارە خوێندنەوەیدا ئەو هەستەم بۆ دروست بێت، پەلەم کردووە و زۆر شتیشم نەوتووە کە دەبوو بیڵێم. بەهەرحاڵ هیوادارم ئەم کتێبە سوودێکی بچووك بە خوێنەری کورد بگەیەنێت، ئومێدەواریشم بگاتە دەستی خوێنەرێك توانای داوەریکردنی هەبێت لەسەر تێماکانی ناو کتێبەکەمان.

ستیڤان شەمزینی

کۆتایی فێبریوەی ٢٠١٩

ئەڵمانیا - شتاینهاگن

-١-

خۆم: بە قووڵی سەیری ئەو دەریایە بکە، دێڕێك، شیعرێکی لەسەر بنووسە!! من دەریام خۆش دەوێت و هەمیشە لە تەنیشتییەوە هەست بە ئارامی دەکەم.

من: بۆ شەپۆلە دوورەکان دەڕوانم، کە چەند نامرادانە دەمرن بێ ئەوەی بگەنە کەنار، ئەگەر ئامانجت کەنار بێت، دەبێت هێزی شەپۆلدانت بەهێز بێت و هەنگاوەکانت گەورە بن.

خۆم: ئەوە گەیشتنە کەناریش چی دەبێت؟. هەموو شەپۆلێك لە کەناردا ون دەبێت راستتر وایە بڵێم دەمرێت.

من: گرنگ نییە لە کوێدا دەمرن، ئەوەی جێی بایەخە لە هەنگاو و گوڕدان تا کاتی مردن.

خۆم: لە دوورەوە ئاوەدانییەك دیارە، ئەوبەرەوە وڵاتێکی ترە، کولتوورێکی ترە.

من: نا، من نامەوێ جگە لە دەریاکە چاوم بۆ هیچ کوێی

تر بڕوانێت، بەو ئاڕاستەیەدا دەڕوانم، تەنیا شینایی دەریام لێ دیارە. دەریا شمشاڵێکە، شەپۆلەکان ئاوازە جادووییەکین و زمانی شاعیر دەپژێنن. لەکن شاعیر دەریا و شیعر یەکێکن.

خۆم: با تۆزێك بێدەنگ بین، رێ بدەین شەپۆل بدوێت و لە باوەشی یەکتردا هەست بە دڵنەوایی بکەین.

من: زۆر باشە، وا دەکەین، پێم خۆشە گوێ لەم شیعرە بگرین کە باسی دەریا دەکات.

خۆم: ئەو فرمێسکە چی بوو. لە چاوانتەوە باری و کوڵمی منی تەڕ کرد.

من: بە بێدەنگی و لە مێشکی خۆمدا دەمووت «تۆ هەست بەوە ناکەیت، چ ئازارێك دەمخوات، رۆژەکانم تێدەپەڕن و مەرگ زیاتر لێم نزیك دەبێتەوە، چەند ئەکتەرێکی باشم کە دەتوانم بۆ دڵخۆشیت خۆم بە باش نیشان بدەم».

خۆم: خەیاڵت بۆ کوێ رۆشتووە، بۆچی بێدەنگیت؟.

من: نا، بێدەنگ نیم، بەڵام وەك سەرۆکی هیندە سوورەکانی سیاتل لە وتارێکدا وتی «وشەکانم ئەستێرەکانن ئاوا نابن». دەمەوێت شتێك بڵێم هەمیشە بمێنێتەوە، وشەکانم دەبێت هێزی مانەوەیان هەبێت بۆ زۆر دوور، دەمەوێت لە رێی وشەکانمەوە زۆر بژیم، چوونکە کاتم زۆر کەم ماوە بە فیزیکی.

خۆم: تۆ زۆر باش دیاریت، تۆنی دەنگت وا ناڵێت کە کەمت مابێت لە ژیاندا، تۆم لە رۆمانێکدا خوێندۆتەوە، نموونەی هێز و ئیرادەیت!!.

من: ئـەوەی چـاوت پێتدەڵێت هەمیشـە جێی گـوومـانـە، چاومان کەمترین جار راستییەکان دەبینێت، پێم خۆشە راستییە تۆقێنەرەکە نابینیت، تا بتوانین چێژ لە ئێستا وەربگرین.

خۆم: واز لە باسی مردن بهێنە، بۆچی هەموو کات بە مردن دەمترسێنیت؟.

من: مردن خۆی لە باسکردنی دەترسێت، تۆ کاتێك باسی مردن نەکەیت واتە هێندە تۆقیویت لێی ناوێریت ناویشی بهێنیت. تەنها ئەوانەی نزیکن لە مردنەوە هەست بە خۆیان دەکەن، هیچ کەسی تر ناتوانێت لێیان تێبگات.

خۆم: واز لە بابەتی مردن بهێنە، دەمەوێت بپرسم چەندە منت خۆش دەوێت؟.

مـن: بـڕیـنی ڕێـگـا کـەنـدەڵانـەکـانی عـەشـق، ریـسـك و سەرکێشیم، هەموو نیشانەکانی عەشقێکی گڕگرتوو نیشان نادەن؟.

خـۆم: مـن شـێـوازی خـۆمـم هـەیـە لـە خـۆشـەویـسـتـیـدا، ئەویش راوەستانە لەنێوان «من» و «منی باڵا»دا.

مـن: «منی بـاڵا» هـەمیشـە سـەرکـوتـکـارە، دیکتـاتـۆرێکی رووتـە، خۆشەویستی بە «من» دەکرێت، «منی باڵا» دوژمنی باوەکوژی خۆشەویستییە.

خـۆم: «منی بـاڵا» رێـگـە نـادات هـەمـوو کـارێـك بـکـەم لـە خۆشەویستیدا، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زۆر خۆشم دەوێی.!

من: دنیای خۆتت لە قاڵبداوە و زیندان کردووە لەسەر

داخـوازیی «منی بـاڵا»!، ئـەو بـەڵایـە لـە کـۆڵ خـۆت بکـەوە، جارێك لە قسەی دەرچۆ و بە قسەی «من» بکە، بزانە چی جوانییەکی لێ قەدەغە کردوویت؟.

خۆم: پێوەرەکانی من بۆ خۆشەویستی جیاوازن، بڕوام بە خۆشەویستی ئەفلاتۆنی هەیە، جەستە هیچ رۆڵێکی وەهای نییە لەو فۆرمە خۆشەویستییەی من دەیخوازم.

مـن: زۆر جـار وەك پیاوێکی بۆهیمی دەردەکـەم، بـەڵام کۆمەڵە پرنسیپێکی خۆم هەن، رەنگە لە هی کەسی تر نەچن، وەلێ ئەوەی سەبارەت بە خۆشەویستی دەیزانم، نابێت بەردی خۆشەویستی بەرز بکەیتەوە، بێ ئەوەی هەموو جمکەکانی بگـریت، دەبێت خۆشـەویستی بە هـەموو تـانوپۆی خـۆیەوە قبـوڵ بکەیت، ئەگەرنا قبوڵت نەکردووە.

خـۆم: مـەرجی جـەستـەت هـەیە بـەسـەرمەوە وانـییە؟ تۆ نابینیت رۆحم لە تۆدا دەتوێتەوە! ئەمەت پێ کەمە؟.

مـن: کێشـەکە شتێکی تـرە، پێکگەیشتنی بایۆلۆژیی نەك ئـارەزوو بەڵکو پێویستیشـە، تـۆ جـەسـتـەی خـۆت ئاوێزانی کەسێك نەکەیت خۆشـت دەوێت، ئەو مافە دەدەیت بە کێ ئاوێزانت بێت؟. خۆشەویستی عیرفانی، شێوازە هەرە کۆن و مازۆخییەکەی خۆشەویستییە، تۆش ئەو مەرجەت لەسەرم هەڵبگرە!!.

خـۆم: تۆ زۆر بەهێزیت، من ناتوانم خۆم بگرم لەبەردەم هێزت، تۆ یەکەم کەسیت لاواز بنوێنم لە بەردەمیدا.

مـن: خـۆشـەویستی زۆرانبـازیی پاڵـەوانـەکان نییـە، تـا هێز

براوە و دۆڕاو دەستنیشان بکات، لە خۆشەویستیدا براوە و دۆڕاو نییە، ئەوەی هەست بەلاوازیی دەکەیت، لە بەرامبەر مندا نییە وەك قەبارە بایۆلۆجییەکە، بەڵکو بەرامبەر بە وزەی خۆشەویستی منە.

خۆم: هەر چۆنێك بێت تۆ گەمەکەت بردەوەو کۆتاییەکەت بە ویستی خۆت دیاری کرد.

من: ئەمە گەمە نییە، بەڵکو کردەیەکی ئیستاتیکی هاوبەشە، ئێمە هەردووکمان پێکەوە ئەو تابلۆیەمان رەنگ کرد.

٢٠١٨-١٠-٢١

کاتژمێر: نۆ و پێنج خولەکی بەیانی

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-٢-

من: لوتەر یامون، لە یەکێك لە سروودەکانیدا دەڵێت «جەستە تەنیا تەرمێك نییە هەناسە بدات». مرۆڤ بۆ ئەوەی نەبێت تەرمێکی هەناسەدەر، دەبێت فیکر بکاتەوە، بخوێنێتەوە، بەڵام «گۆتێ» وتەنی «کتێبە هەرە مەزنەکە، کتێبی خۆشەویستییە».

خۆم: تێگەیشتن لە ژیان یان مردن، پێویستی بە عەقڵە، عەقڵیش لە کەللەی هەموو مرۆڤێکدا نییە!، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە زۆر جار ئاوەزمەندیش سەرێکی لە شێتیی دەردەچێت!، من هیچ کات توانای جیاکردنەوەی ئاوەزمەندان

و شێتەکانم نییە، لە نێوان عەقڵ و شێتییدا تاڵە مویەك هەیە، دەترسم شێتی هەموو عەقڵانییەتێکی لە خۆ گرتبێت.

من: کەواتە با باسی مردن بکەین.

خۆم: قسەکردن لەسەر مردن، هەمیشە ترسێکی تێدایە، چون مرۆڤ نەمری پێ خۆشە، بەڵام ئامادەم.

من: خۆ مردن هەموو کاتێك خراپ نییە «بۆ نموونە مردنی گیڤارا». جاری وا هەیە مەرگ چاکەکارە، پێش ئەوەی وێنا جوانەکەمان قێزەون بێت فریامان دەکەوێت.

خۆم: مردن بۆ خەڵك، زەلکاوێکی عاتیفییە، ئاگامان لە هەندێك مردن نەبێت بە تەوتەمپەرست کۆتاییمان دێت، گرنگە ئازا بین، لە هیچ مەرگێکدا نەکەوینە ژێر داروپەردووی سۆز، بەڵکو دەبێت وەك راستییە تاڵەکە قبوڵی بکەین. جگە لەمە خەڵك ناتوانن بیر لەو دیمەنە بکەنەوە کاتێك خۆیان لەناو گۆڕدان، ئەمە تۆقێنەرە و بەرگەی ناگرن.

من: ئێمە کاتێك دەخرێینە گۆڕەوە، ئامادەمان دەکەن بۆ خەونێکی هەتاهەتایی یان بۆ سەرەتایەکی تر. لە زمانی کوردییدا بەم پرۆسەیە دەوترێت «مردوو ناشتن»! ئەمە مانای وایە وەك تۆوێك لە زەویدا دەمانچێنن، بۆی هەیە جارێکی تر وەك گوڵێك سەردەربهێنینەوە، ئەگەر مەرگ بەرزبوونەوە بوایە بۆ ئاسمان دەبوو گۆڕستانەکانمان لە بۆشایی ئاسماندا رۆنایە.

خۆم: بۆ ئەوەی لە مردن تێبگەین، دەبێت سەرەتا لە ژیان تێبگەین، ژیانیش وەك سەمای «بەهاراتا ناتیای» هیندیی

هەمووی ئاماژە و کۆدە، زۆر دەگمەنن ئەو مرۆڤانەی دەمرن و لە ژیان تێگەیشتبن.

من: ژیان بۆ خۆی شانۆیەکی سینیزمییە «گاڵتەجاڕی» بۆ ئەوە نییە تێی بگەیت، بەڵکو دەبێت چێژی لێ وەربگریت، بۆ ئەوەشی بتوانیت چێژی تێدا وەربگریت، پێویستە وەك ئەکتەرێکی گاڵتەجاڕ خۆتی بۆ ئامادە بکەیت!. ژیان شتێکی زۆر جیددی نییە، پێویستە بە یارمەتی پێکەنین بەڕێی بکەین، چوونکە هەموومان بە روو گرژیی و گریانەوە دەمرین.

خۆم: کەواتە دەبێت بە دوای وەهم نەکەوین، بەڵکو بۆ ئەو هەقیقەتە بژین کە ژیان کاتییە، ئەمە هەموو راستییەکەیە.

من: من ئەو دیدە «نیتچە»ییەم هەیە هەقیقەت شتێك نییە بیدۆزینەوە، بەڵکو راستی شتێکە دەبێت دروستی بکەین.

خۆم: دروستکردنی هەقیقەت رەنگە شتێك بێت بتوانێت رازیمان بکات تا بەردەوام بین لەم گەمەیەی ژیاندا!.

من: ئەوەش ناتوانێت من رازی بکات، مرۆڤ رازی تەرمە هەناسەدەرەکەیە، دەبینم هەمیشە رەخنەم لێدەگیرێت لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نییە رازیم بکات!، ئاخر بۆچی شتێك بوونی هەیە هێندە بێ خەوش بێت بواری ناڕەزایی بۆ کەس نەهێڵێتەوە؟.

خۆم: مرۆڤ بۆ ئەوەی رازی و دڵنیا بێت ئاین و خودای داهێناوە، لەوە دەچێت چیتر خودا و ئاین ئەو دەسەڵاتەیان نەبێت، دڵنیایی و قنیات بە مرۆڤ ببەخشن.

من: من کارم بە کەسی تر نییە، خودایەکم بۆ خۆم

داتاشیوە، ئەو خودایە ئەنێرژییەکی پۆزەتیڤە لەناو خودی خۆمدا، لەو کاتەی هەموو تابلۆکان تەڵخ دەبن، دیمەنێکی روونم لەناو جوگرافیاکانی هەستمدا نیشان دەدات و پێمدەڵێت دڵت بەمە خۆش بکە. بە قسەی «ڤۆڵتێر»م کرد کە وتی «ئەگەر خودا نەشبێت، دەبێت خۆمان ببینە ئافرێنەری».

خۆم: سارتەر جارێك وتی «مرۆڤ مەحکومە بە ئازادیی» ئەو قسەیە ئەو کاتە راست دەبوو ئەگەر بیوتبا «مرۆڤ مەحکومە بە کوێرەوەریی ژیان» یان «مرۆڤ مەحکومە بە مردن». شتێك تاوەکو ئێستاش گرێکوێرەی منە ئەوەیە هێشتا نازانم، مرۆڤ لە ژیاندا چی دەوێت؟.

من: ئاسانە، مرۆڤ ژیانی دەوێت، ئەوەش بەڵا هەرە گەورەکەیەتی، لە وەهمێکدا نغرۆ بووە پێیوایە ژیان بەختەوەریی تێدایە!، ژیان بەختیاریی تێدا نییە، بەختیاریی وەك هەقیقەت دەبێت خۆمان دروستی بکەین.

خۆم: بیرۆکەکەت جوانە، بەم پێیە مرۆڤ دەژی و هەوڵدەدات بۆ دروستکردنی بەختیاریی نەك بۆ دۆزینەوەی، بەڵام کێ لەم ئەندێشەیەی تۆ تێدەگات؟. ئەمە ئەو پرسیارە بێ وەڵامەی ناوی مێشکی منە.

من: شتێك لە مرۆڤەوە فێری بووبم ئەمەیە، کەس لە کەسی تر تێناگات، بە تایبەت لە کۆمەڵگەی ئێمە کە رۆشنبیریی دیاردەیەکی دەنگییە و رۆشنبیرانیش تەنها غەڵبەغەڵبیان دروست کردووە.

خۆم: ئێستا خەریکە لەوە تێدەگەم، ئەو هەموو خەنجەر وەشاندنەت لە خوئەڤینی مرۆڤ، سەرچاوەی ئەو هەموو کینەیە لە بەرامبەرت لە ئارادایە!.

من: بۆم گرنگ نییە قبوڵکراو یان نا، دەزانم لەوەتی هۆشم کردووەتەوە لە دۆخێکی «کافکا»ییدام، باسی دۆخ دەکەم، نەك بیرکردنەوە. هەر ئەوەی بوومەتە دەعبایەکی وەك «سامسا»ی پاڵەوانی «مەسخ» سەلمێنەری ئەوەیە لە دۆخێکی تەواو کافکاییدام، هەر بۆیە زۆر جار وەك دەعبایەکی بۆهیمیی دەبینرێم.

٢٠١٨-١٠-٣٠

کاتژمێر: چواری بەرەبەیان

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-٣-

خۆم: رۆمانسیزمی کۆتایی سەدەی حەڤدە دوالیزمی خۆشەویستی و مردنیان پێکەوە گرێدەدا، بەڵام پێناسەی تازە ئەوەیە خۆشەویستی و ژیان پێکەوە بەستراون.

من: هەتا فێر نەبین خۆشەویستی بکەین، فێر نابین چۆن بژین. ئەوەی گەردوون هەڵدەسوڕێنێت خۆشەویستییە. لاهوتییەکان دەڵێن خودایە، بەڵام خوداش هەر پارچەیەکە لە خۆشەویستی.

خۆم: مرۆڤ کە فێری خۆشەویستی بوو، تامی ژیان دەکات، ئیتر ترسی لە مەرگ نامێنێت، چوونکە هەست

دەکات ئەوەی پێویستە بیکات ئەنجامی داوە.

من: ژیان خۆی سپەیسێکە لەنێوان هەردوو خاڵی لە دایکبوون و مردندا، ئەوەی ئەم بۆشاییە بە خۆشەویستی پڕ نەکاتەوە، نە لە دایکبووە و نە ژیاوە و نە دەمرێت، بەو پێیەی بوون بە خۆشەویستیدا دەناسرێتەوە.

خۆم: وتەکانت پڕن لە حیکمەت، لە بارەی خۆشەویستییەوە بدوێ، بێدەنگبوونی تۆ خیانەتە لە خۆشەویستی!.

من: مەرج نییە، هەمیشە وتن شتەکان روون بکاتەوە، هەردەم شێواندنەکان لە وتەکانەوە دەستپێدەکەن، هەروەك شیعرەکەی «نیکۆلاس کاتانۆ» دەڵێت «من زۆر جار، لە وشەکان پەشیمان دەبمەوە، بەڵام هەرگیز لە بێدەنگییەکانم نا».

خۆم: ژیان خۆشەویستییە، ئەمە ئەو فاکتەیە تاراددەیەك هەمووان لەسەری کۆکین، بەڵام ئەی مردن چییە؟.

من: مردن تاکە هەقیقەتێکە ناتوانین تەفسیری بکەین، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت لێی بترسین، چوونکە لەو باوەڕەدا نیم هێندەی ژیان تاڵ بێت.

خۆم: ئەگەر ژیان خۆشەویستییە بۆچی بە تاڵ پێناسەی بکەین؟، خۆشەویستی و شادیی دوانەیەکن پێکەوە!!.

من: ئەگەر ژیان تاڵ نەبوایە، مرۆڤ پێویستی بە داهێنانی خۆشەویستی نەبوو، مرۆڤ خۆشەویستی داهێناوە نەك دیاردەیەکی خۆڕسکی دەروونی خۆی بێت، سروشتە

خۆڕسکەکەی مرۆڤ دڕندەییە، کاتێك زانیمان ئەو دڕندەییە سروشتییە وێرانترمان دەکات، ژیانمان تفتتر دەکات پەنامان بۆ خۆشەویستی برد، یان بابڵێم خۆشەویستیمان داهێنا.

خۆم: باوەڕت بە ژیانێکی تر لە دوای مردن هەیە؟, واتە زیندوبوونەوەی پاش مەرگە فیزیکییەکەمان.

من: ئەم پرسیارە هێندە کۆنە بە قەد تەمەنی هەبوونی مرۆڤ، لەوەتی مرۆڤ هۆشی کردۆتەوە ئەم پرسیارە ئامادەیەی هەبووە، ئەو وەڵامانەی تاوەکو ئێستا لە ئارادان، لە روانگەی لاهوت یان فەلسەفەوەن، ئەوانەش هەموو شێمانە و گریمانەیین نەك کۆنکرێت، لێ لاهوت و فەلسەفە دوور نین لە زانست، بەڵکو لەسەر زانست رۆنراون، بگرە تاکو سەردەمی «رۆشنگەری»ش فەیلەسووفەکان هەم دانا بوون، هەم زانا، بۆیە گریمانە فەلسەفییەکان بە تێپەڕینی کات بوونەتە فاکتی زانستی، بەڵام کەی زانست توانی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە جا بە هەر بارێکدا بێت ئەوەیان زۆر گرنگ نییە، وەك خۆم چاوەڕێی زانست دەکەم و دڵنیاشم لەوەی رۆژێك دەتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە هەرە دێرینەی مرۆڤ بداتەوە.

خۆم: کەواتە ناتوانین پێناسەی مردن بکەین!، دەبێت جێی بهێڵین بۆ زەمەن.

من: جارێ با ئێمە پێناسەی خودی ژیان بکەین کە ئەزموونی دەکەین، دواتر رەنگە ئاسان بگەینە پێناسەی مردن، هەروەك شاعیری یابانی «مۆریتاکە» لە یەکێك لە

هایکۆکانیدا دەڵێت «وەك گوڵە نیلۆفەڕ، ژیانی من، سەراپا وەك ڕۆژێك دێتە بەرچاو». هەر بە ڕاستی ژیانمان هەر یەك تاکە ڕۆژە.

خۆم: مەرگ کۆدێکی سەیرە، ڕەنگە بتوانین لە کۆتاییەکانی ژیانـدا لێی تێبگەین، هـەروەك چـۆن «ڤـیکتـۆر هـۆگـۆ» لە سەرەمەرگدا وتی «ڕووناکییەی ڕەش دەبینم». ئەو چرکەساتە ڕەنگە تێبگەین، بەڵام چیتر توانامان نییە لە بارەیەوە بدوێین.

من: مردن تەنها مردنی جەستەیە، ونبوونە لە بەرچاوی خەڵك، بڕوام بەوە نییە ماددە بمرێت، تەنیا دۆخی دەگۆڕێت!. تکایە کە من ون بووم لەبەرچاوانت وا مەکە نەتناسیوم، هەوڵمەدە بۆ لە بیرکردنم، باشترین کار بیکەیت داگیرساندنی مۆمێکە لەگەڵ خوێندنەوەی تێکستەکانمدا، بەڵام نەکەیت بە دڵێکی تەنگەوە ئەم کارە بکەیت.

خۆم: کێ ناڵێت بەو هەموو برینەوە پێش تۆ ون نابم، ئاخر گۆمێکم چەندان جار لیخن کرام، بەردی زۆرم تێگیراوە، دڵیان شکاندووم لە ژیان، چاوەڕێی تەڕایی روونی تۆ بووم تاکو بمژێنیتەوە، سەیرە بەو هەموو هەستەوە، چۆن دەبێت وەك مردوو بژیم؟!.

من: تۆم خۆش دەوێت!. ئەوەندە ئاسان بە کەسێك ناڵێم خۆشم دەوێیت!, دڵنیام ئەفسوونێك لە تۆدا هەیە، راستە من جادووگەری وشەم، بەڵام تۆ ساحیری دڵ بردنی، ئەوە نییە بە ئاسانترین شێوە دڵت بردم.

خۆم: زۆرجار وا هەست دەکەم زۆر تەڵخیت، بۆم جیا

ناکرێتەوە چۆن بیر دەکەیتەوە و چی لە مێشکتدا هەیە!.

من: مرۆڤی جوان، هێندەی روونییەکەی لێڵە، تۆ ناتوانیت کەشفی بیر و خەیاڵاتی بکەیت، کەچی تۆ هێشتا نابینیت ڤیزام پێداویت ئەو جوگرافیا تاریکانە بەسەر بکەیتەوە لە ئەندێشەی مندا هەن، وریابە چرای خۆشەویستییەکەت توند بگرە، نەك خوانەکردە لە بەرزاییەکانی بیرمەوە هەڵدێرێیت.

خۆم: خۆشەویستیتم قبوڵ کردووە، بەڵام لە بەیەك گەیشتنی جەستەکان زۆر دەسڵەمێمەوە، بە جۆرێك بە بیرکردنەوە لێی تووشی جۆرە شڵەژانێك دەبم تێیدا ون دەبم، تۆ دەرکی ئەوەت کردووە خەریکە خۆم ناناسمەوە؟.

من: ئەو خۆشەویستییەی رێگری لە بەیەك گەیشتنی جەستە بکات، نەك نابێت پێی دڵخۆش بین، بەڵکو دەبێت نەفرەتی لێ بکەین. کێشەی تۆ لەوەدایە تەنها خورمات دەوێت، کەچی من خورما و مێوژیشم دەوێت.

خۆم: لە دیدی مندا خۆشەویستی مەحکوم ناکرێت بە پەیوەندیی سەرجێیی، رۆح زیاتر رۆڵ دەگێڕێت وەك لە جەستە.

من: خۆشەویستی هێزی کێشکردنی هەیە، هەمیشە دوو جەستە بەرەو یەك رادەکێشێت، کاتێك جەستەکان ئاوێزانی یەکتر دەبن، رژێنی خۆشەویستی هۆرمۆنی توانەوە دەردەدات، خۆشەویستییەك نەتوانێت دوو لەش ئاوێتەی یەکتر بکات، جێی گومانە و دەبێت باوەڕ بەوە بکەیت ئەم

پەیوەندییە هێشتا نەبووەتە خۆشەویستی.

خۆم: هێشتا سەر لەوە دەرناکەم، بۆچی لە پێناسەی نوێدا خۆشەویستی و سێکس پێکەوە دەبەسترێنەوە؟. بۆ دەبێت ئەو دووانە تەواوکەری یەکتر بن؟. کێ ئەم رێسایەی سەپاندووە؟.

من: ئەوە رێسایەکی سروشتیی و خۆرسکە بێ سێکس هیچ مانایەك بۆ خۆشەویستی نامێنێتەوە، بە پێچەوانەشەوە بێ خۆشەویستی هیچ هۆکارێك نییە بۆ ئەنجامدانی سێکس، چوونکە لەو دەمەدا سێکس دەبێتە پووچترین پرۆسە.

خۆم: هێشتا بۆم هەرس ناکرێت، سێکس و خۆشەویستی دوالیزمێك بن یەکتر تەواو بکەن، تا ئێستا وەها تێبینیم کردووە ئەو دووانە پێچەوانەی یەکترن!.

من: لە روانگەیەکی فەلسەفیانەوە بۆچوونی خۆمم بۆ شی کردیتەوە، چوونکە تۆ سۆفیستانە سەیری خۆشەویستی دەکەیت و پێتوایە نابێت جەستە رۆڵی هەبێت، منیش دەڵێم مرۆڤ بە هۆی جەستەیەوە هەست بە بوونی خۆی دەکات.

٢٠١٨-١١-٤

کاتژمێر: چواردە و سی خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-٤-

من: با بگەڕێینەوە سەر جەستە. بێ بایەخکردنی جەستە لە بواری فەلسەفیدا، ئەفلاتۆن تیۆریزەی کردووە، بەدیتنی ئەو جەستە لە خاکەوە پەیدابووە و رۆح لە ئاسمانەوە

دابەزیوە، ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە لە بواری فەلسەفیدا وەك هێڵێکی درامی لە ئەفلاتۆنەوە درێژ بووەتەوە تاکو بە ئێستاش دەگات. ئەمە هەر ئەو شتەیە «نیتچە» تێبینی کرد کە مێژووی مرڤایەتی چیتر نییە جگە لە مێژووی نابووت و سەرکوتکردنی جەستە.

خۆم: ئەمە هەمان روانگەیە کە ئاینەکان پێداگریی لەسەر دەکەن، هەر لەو رێگەیەشەوە بووە بە بەشێك لە کولتووری ئێمە. مرۆڤی کورد لە هەر ئاستێکی رۆشنبیریدا بێت تا ئێستا نامۆیە بە جەستەی خۆی!.

من: تۆ سەیری شانۆی کوردیی بکە، هەموو فۆکۆسێکی لەسەر حیوارە نەك جوڵەی جەستە، ئەوەندەی من تێگەیشتبم، خراپترین جۆری نواندنی شانۆیی ئەو نواندنەیە تەنها پشتی بە هێزی وشە بەستووە و جوڵەی جەستەی وەلا ناوە. تەنانەت ئێمە سەماشمان نییە،! هەڵپەرکێیەکمان هەیە تاك لە بۆتەی گشتدا پێوەند بووە، بەو پێیەی ئەو سەمایە پرۆسەیەکی دەستەجەمعییە، تاك تێیدا ونە، ئەمەش زادەی ئەو ترسەیە لە دروستبوونی تاکێك خاوەندارێتی جەستەی خۆی بکات، هەروەك چۆن دیسپۆتیزمە کولتوورییەکە بە گشت نەبێت بواری بیرکردنەوەشمان نادات.

خۆم: کەواتە ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە تۆ بۆ جەستەی ژن دەنووسیت یان بۆ رۆحی ژن؟.

من: مرۆڤ تاکو جەستەی نەبێت هیچی تری نییە، لای من مرۆڤ جەستە و ئیحساس و بیرە، ژنیش وەك مرۆڤ دەبینم،

بۆ هەموو ئەو جوانیانەی ژن دەنووسم.

خۆم: سەیرە سەرباری ئەوەی لە بوارێکی دیاریکراودا نانووسیت، بەڵام هەموو شیعرەکانت بۆ ژنن، خۆت بە کۆمۆنیست دەزانیت بەڵام هیچ شیعرێکت نییە رەهەندی چینایەتی هەبێت!!.

من: پەیوەندیی من بە کۆمۆنیزمەوە لە قۆناغێکدایە، خەڵك وا دەزانن دەستبەرداری ئەو بیرۆکەیە بووم، یان وا تێدەگەن کۆمۆنیستبوون بەشێك بێت لە مێژووی تێپەڕێنراوم، نا، نەخێر، بەم جۆرە نییە، هیچ نەبێت شیعر بە کۆمۆنیزمەوە دەمبەستێتەوە، ئەمە هەمان ئەو کۆنسێپتەیە «ئالان بادیۆ» لە بارەیەوە دەدەوێ و دەڵێت «شاعیرەکان لەبەر هۆکارێکی جەوهەری کۆمۆنیستن»!. بادیۆ ئەو هۆکارە بە زمان دەستنیشان دەکات، بەو پێیەی شاعیرەکان ناوی نوێ بۆ شتەکان دەدۆزنەوە کە پێشتر ناویان نەبووە، ئەمیش پێشکەشی هەمووان دەکرێت!. رەنگە لە ئێستادا تەنها و تەنها شیعر من بە کۆمۆنیزمەوە ببەستێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆم بە شاعیری پرۆلیتاریا نازانم، لای من بازنەکە فراوانترە، لە دیدی مندا شیعر بۆ هەمووانە.

خۆم: وتت شیعر بۆ ژن دەنووسم، ئەمە خۆی لە خۆیدا تەسککردنەوەی بازنەکەیە نەك فراوانکردنی!.

من: بەڵێ بۆ ژن دەنووسم، چوونکە ژنم خۆشدەوێت!، ژنم خۆش دەوێت، لێ هیچ کات ئاسودەگیم لەگەڵیاندا نەبووە!، رەنگە بێ ئەوەی بەخۆم بزانم مازۆخی بم و چێژ لە

ئازاردانەکانم وەربگرم، بە لەبەرچاوگرتنی ئەمەش هەمیشە بۆ ژن دەنووسم.

خۆم: شەڕی کامۆ و سارتەر لەسەر بەدەستهێنانی دڵی ژنان بوو، ئاخر سارتەر ئیرەیی بە کامۆ دەبرد کە ئەو هەموو ژنە پێی سەرسام ببوون، بەڵام هەوڵیدەدا ئەم ئیرەییە بخاتە فۆرمی شەڕێکی فیکرییەوە، تۆش هەمان شەڕت لەگەڵ دەکرێت لەلایەن هەندێ هاوڕێتەوە و دەیانەوێت ئەم ئیرەییە بخەنە چێوەی جیاوازیی و سەرەڕۆیی بیروڕاوە، کەچی ئەوەی من دەیبینم تۆ هەمیشە دۆڕاویت لە دۆزینەوە و بەدەستهێنانی ئەو ژنەی دڵی خۆت دەیخوازێت!.

من: ئەو شەڕە نەگریسەم دژی خۆم پێ راناگیرێت، بەڵام هەر دەنووسم و تێمای سەرەکی نووسینەکانیشم ستایشی ژنە. زۆر جار دەگەمە ئەو دۆخە دەروونییەی نازانم بۆچی دەنووسم!، بەڵام دەزانم دەبێت شتێك بە ژن بڵێم لە رێگای تێکستەوە. زۆر لە پیاوەکانی هاوڕێم ئیرەییم پێ دەبەن کە هەمیشە بۆ ژنان سەرنجراکێشترین پیاو بووم، بەڵام من وەك راوە ماسی لەگەڵ ژنان بەرخود ناکەم و نامەوێت بە کۆمەڵ بیانخەمە تۆڕی ئارەزووەکانمەوە. نا، نەخێر دەمەوێت وەك باڵندەیەك تەنها لەگەڵ ئەو مەلەدا بفرم هێشتا لە قەفەزی پیاوێکی تردا زیندانە، بۆیە هەمیشە بۆی دەنووسم!.

خۆم: جارێك وتت باوەڕم بە دۆنادۆن هەیە، پێتوایە ژنێك هەبێت لە کۆنەوە رۆحی ئاوێتەی رۆحت بووبێت!؟.

من: مرۆڤێکی ئایندار نیم، کەچی بڕوام بە دۆنادۆنی

گیانەکان هەیە و پێموایە گیانی من و ژنێك بەر لە هەزاران ساڵ لە یەکتر نزیك بوون، رەنگە دوو پەروانە بووبن لەسەر پەڕەی گوڵێك یەکتریان ناسیبێت، من بۆ ناسینەوەی ئەو پەروانەیە دەنووسم!.

خۆم: کەواتە تۆ عاشقیت بە مانا سۆفیگەرییەکەی، پێموایە عەشق درۆیەکە دژی تەنهایی، تەنهاییش راستییەکە دژی عەشق.

من: وایە عەشق جنونە، حاڵەتێکی دەروێشانەیە، خۆشەویستی ئەو پەیوەندییە دڵخوازەیە زۆرینەی مرۆڤەکان ئارەزووی دەکەن، کەچی من ناتوانم خۆشەویستی بکەم ئەگەر نەگاتە عەشق، ئەگەر نەبێتە ئەو شێتییەی لە کرۆکی عەشقدا هەیە، هەر ئەمە پێم دەڵێت یان کوڕی زەمەنێکی زۆر دێرینم، یاخۆ هێشتا سەردەمی من نەهاتووە.

خۆم: شێتەکان جوانترین مرۆڤەکانن، زۆرجار بەهەڵەدا دەچین کە شێتی و ئەحمەقی لە یەکتر جودا ناکەینەوە!.

من: شێتی درۆیەك بوو لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا داهات، فوکۆ لە کتێبەکەیدا «شێتی و نائاوەز، مێژووی شێتی لە چاخی کلاسیکیدا». ئەم بابەتە دەباتە ناو فەلسەفەوە، ئەو نموونەی «کەشتی دەبەنگەکان» دەخاتە بەر باس کە لەو سەردەمەدا کۆمۆنەکان شێتەکانیان پێ دەبردە ناوەڕاستی دەریاکان و بەدەم شەپۆلەکانیانەوە دەدان، ئەمێستا هەر مرۆڤێکی دژە سیستم بەو شێتە لە قەڵەم دەدرێت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە سێبستیان برانت رۆمان

لەبارەیەوە دەنووسێت، ئەوەی گۆڕاوە لە بری لەناوبردنی فیزیکی لەناوبردنی دەروونی و مەعنەویی پەیڕەو دەکرێت.

خۆم: مردنی مەعنەویی زۆر ترسناکترە لە مردنی فیزیکی!، ئەوەی منی تۆقاندووە هەردوو مردنەکە بەیەکەوە روو بکەنە کەسێك.

من: ناتوانم وەها بیر بکەمەوە، ژیان وەك ئاوی کانی دەڕوات هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکەی، مردن هەروەك ژیان دیاردەیەکی جەستەییە، ژیان لەناو مێژوودا درۆیەکی دڵخۆشکەرە و مرۆڤ بۆ نەمریی خۆی داهێناوە، بەداخەوە ژیان یەك جارە، وەلێ من هەموو رۆژێك بەدەم ئازارەوە دەمرم.

خۆم: کەواتە بژی بەو جۆرە دەتوانیت بژیت. ئێستا حەزدەکەم بزانم مێشکت چی تێدایە؟.

من: بە دیار خۆمەوە دانیشتووم، دەمەوێت تەنهابم تەنیاتر لەم تەنهاییەی ئێستام. بیر لەوە دەکەمەوە چۆن نەیانهێشت خەونەکەم تەواو بکەم، فڕێیاندامەوە ناو ئەم واقیعە پڕ ئازارە. دەمەوێت دوو دێڕ بۆ یارم بنووسم «سوپاست دەکەم کە پێتوتم تۆ مەلێکی تەنهایت، یاوەرت نییە لە فڕیندا».

خۆم: شتی سەیر و سەمەر لە مێشکتدا هەیە، لە هەمووشی گرنگتر هەموو شتەکان وەك ئەڵماس گرانبەهان.

من: پێتوایە کەسێکی دیکە هەبێت دیقەت لەو شتە وردانە بدات جگە لە من؟. بۆ من وتنی شتی قورس و گران گرنگ نییە، گرنگ دۆزینەوەی مانای گەورەیە لە شتی زۆر

وردیلەدا.

خۆم: بەڵام زۆرجار دۆزینەوەکانت هێندەی چەکی ئەتۆمی بۆ کۆمەڵگە ترسناکن! چوونکە ناتوانێت هەرسیان بکات.

من: بە قەد رقی هەندێك خەڵك لە خۆم و روانگەکانم دڵخۆشم بەمە، ئاسوودەشم بەوەی بۆچوونەکانم هەندێك کەس وەك گای ئیسپانی شێت دەکات، کەواتە زوو زوو بەو پەڕۆ سوورە سەرچۆپی دەگرم.

٢٠١٨-١١-٨

کاتژمێر: یانزە و چل خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-٥-

خۆم: جارێك وتت مردن هێندە ناخۆش نییە، گەر وا بوایە کەسێك دەگەڕایەوە!، لە راستیشدا دیمەنی ئاوابوون جوانتر خۆی دەنوێنێت وەك لە هەڵاتن.

من: مرۆڤ هەرچی داهێنا بۆ لە بیربردنەوەی مردن یان فەرامۆشکردنی بوو، بەڵام ناکام مایەوە!، بۆیە بڕوا دەکەم مرۆڤ بۆ ژیان لە دایك نابێت، بەڵکو بەناو ژیاندا تێدەپەڕێت بەرەو مەرگ.

خۆم: هێندە شیرین باسی مەرگ دەکەیت، وەك ئەوەی پەسنی عاشق بۆ مەعشوقەکەی بێت!. تێزە بەناوبانگەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە هەرچی وتی «بژی مەرگ» بێ راڕایی فاشیستە.

من: باسەکەی ئێمە لە دەرەوەی سیاسەتە، قسەکردنە لەسەر «مەرگی رووت»، بەو مانایەی مردن وەك رەهایەکی سروشتی سەیر بکەین. خۆ دروشمی من تەواو پێچەوانەی دروشمە فاشیستییەکەیە، چوونکە بە دروشمی «بژی ژیان، بمرێ مەرگ، نەفرەت لە سەرەتان»، رووبەڕووی نەخۆشییەکەم دەبمەوە، زۆر جار ئەو مرۆڤانەی باسی مەرگ دەکەن، عاشقی ژیانن.

خۆم: هەر چۆنێك پێناسەی مەرگ بکەین، لەنگ و ناتەواوە، چوونکە تاکە شتە ناکەوێتە ناو ژیانەوە، مرۆڤ دەتوانێت تەنها پێناسەی ئەو چەمکانە بکات لە ژیانیدا دەیانبینێت.

من: مردن ئاگرێکی تاریکە، دەتوانین بۆنی دوکەڵەکەی بکەین، من چەندان جار مردووم، هەموو حاڵەتێکی کۆما جۆرێکە لە مردن، لەوە تێگەیشتووم مردن هێندە وەحشەتناك نییە، بەڵکو هەمان خەو و سکونی پێش لە دایکبوونە. بۆ ئەوەی بژین پێویستمان بە هەناسەدانە، بۆ مردنیش چاونوقاندن، هەرچەندە ئێستا نامەوێت چاوم دابخەم.

خۆم: بۆچوونەکانی تۆ لەگەڵ روانگەی قوتابخانەی وجودییەکان یەکدەگرێتەوە، ئەوان وتیان ژیان هەموو چیرۆکەکە نییە!!، بەڵکو مەرگ وەك رەهایەك دەخەنە پێش چاوی مرۆڤ، ئەمە بێ ئەوەی ژیانیش ببوغزێنن.

من: هەروەك مارکس زیاتر سەرسامم بە «هیگل» بە

تایبەت بە کتێبە هەرە بەناوبانگەکەی «فینۆمینۆلۆژیای رۆح»، کە هەر وەك چۆن «کۆژۆ» پێیوایە «لەدوا شیکردنەوەدا دیالێکتیکی هیگل بە فەلسەفەی مەرگ ناوزەد دەکرێت». لە دیتنی مندا مەرگ ئەنجامی ژیانە. زیندەوەرێك تاکو نەژی ناشمرێت، ئەمە هەر ئەو فاکتە بوو لە سوکراتەوە درێژ بۆتەوە تاکو فرۆید و شۆپنهاوەر. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ دەبێت ئەو ماوە کورتەی لەبەردەستییەتی «ژیان» چێژی لێ وەربگرێت.

خۆم: فەلسەفە بۆچوونێکی کۆنکرێتی نییە سەبارەت بە مەرگ، سیسرۆن دەیووت «فەلسەفاندن فێربوونە کە چۆن بمریت!». بەڵام ستوونی هەرە گرنگی فەلسەفە لە دوای رۆشنگەرییەوە ئەوەیە فەلسەفاندن فێربوونە کە چۆن بژیت. مارکس هەموو ژیانی فەلسەفیی خۆی بۆ ئەوە تەرخان کرد بڵێت کاری فەلسەفە بە تەنها شرۆڤەی جیهان نییە، بەڵکو گۆڕینییەتی بە جیهانێك مرۆڤ تێیدا هەست بە چێژی ژیان بکات.

من: مارکس فەیلەسوفێکی ماتریالیستە، ئەگەرچی وەك فەیلەسووفێك دەست پێدەکات، بەڵام بە کتێبی «کاپیتال» وەك ئابووریناسێکی سەرمایەداریی کۆتایی دێت، لە هیچ شوێنێکدا مارکس ئاوڕ لە چەمکی مەرگ ناداتەوە، بەڵکو چاوی بڕیوەتە ژیان، مارکس فەیلەسووفی ژیان و هیومانیزم بوو.

خۆم: مارکس، لە رووی ماتریالیستییەوە درێژکراوەی

«دیموکریتس»ە، بە بۆچوونی ئەو فەیلەسوفە یۆنانییە دێرینە جیهان لە ئەتۆم پێکهاتووە، هیچ بوونێك لە دەرەوەی ئەتۆم نییە، ئەم روانگە ئەتۆمیستییە بە پوختەکراوی دەگاتە سەردەمی مارکس، بۆیە مارکس بیر لە مردن ناکاتەوە، بەڵکو بە چڕی باسی ژیان دەکات، وەك چۆن ئەبیکۆریستەکان پێیانوایە مەرگ پەیوەندیی بە ژیانەوە نییە و ناکەوێتە نێو بازنەی ژیانەوە.

من: تا ئەو شوێنە لایەنگری «مارکس»م بیر لە کوالێتی ژیان دەکاتەوە، بیرکردنەوە لە ژیان کاری مرۆڤی مودێرنە.

خۆم: بەدەر لەم باسە، ئەوەی جێگەی سەرنجە لە نێوان سۆفیست و ماتریالیستدا، لە نێوان موریدی ئیشراق و مرۆڤی نوێی خۆرئاواییدا، لە نێوان حیکمەتی بودا و تێزەکانی مارکسدا، رووخساری تۆم بۆ نادۆزرێتەوە. کۆکردنەوەی ئەو هەموو شتە ناکۆکە لە خۆتدا کارێکی ئاسان نییە.

من: پرۆتاگۆراس لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین وتی «مرۆڤ پێوەری گشت شتێکە»، هیچ فەلسەفە و ئایدۆلۆژییەك بە پێی پێویست تەواو نییە، مرۆڤبوون پێوەری هەموو شتێکە، خۆم بە موریدی هیچ شتێك نازانم، جگە لە بیرکردنەوە و روانگەیەکی ئینسانیانە، ئەمەش بە تەنیا لە یەك شوێن دەست ناکەوێت، دەبێت هەر بەشەی لە جێگەیەکەوە بهێنیت. ئەمە رێك پەشیمانبوونەوەی منە لە رەهاگەرایی بیری مارکسیزم، بێگومان مارکس لە سەدەی بیست و یەکدا بژیابایە، مانیفێستی کۆمۆنیستی نەدەنووسی!، یان لانیکەم

بەو جۆرە نەیدەنووسی وەك لە ساڵی ١٨٤٨دا نوسیوویەتی.

خۆم: تا ئێرە هەموو شتێك روونە، بەڵام هەمیشە فۆرمی بیرکردنەوەت لێڵە، چەند دیقەت دەدەم تێناگەم.

من: من زۆر قووڵم، دەریام، تۆ ناتوانیت لەسەر رووی دەریا جگە لە کەف هیچی تر ببینیت، بۆ ئەوەی مرواری لە ئەندێشەمدا بدۆزیتەوە، دەبێت بگەیتە قووڵایی دەریای بیر و هەستم، لەوێ تێدەگەیت ئەم دەریا مات و مەلوولە چەندین گەنجینەی گرانبەهای لە هەناوی خۆیدا شاردۆتەوە، وەرە، وەرە، بەرەو قوڵاییەکەم، ئەی ئەو کەسەی ژیانی خۆمت لەگەڵ بەش دەکەم.

خۆم: کەواتە بۆچی هێندە لە ژیان دەترسیت؟ یان بۆچی گلەیی لە شانست دەکەیت لە ژیاندا؟.

من: سواڵکەری بەر دەرگای ژیان نیم، هەمیشە بانگی مەرگ دەکەم، تاکو ژیان بەناچاریی خۆی بێتەوە بەر دەرگام. سەبارەت بە شانسی خۆم لە ژیاندا، پێموایە مرۆڤ پەیوەندییەکی بەتینی بە سروشتەوە هەیە، ئەستێرەی من لە درەوشانەوەدا نییە، چەند خۆم ماندوو بکەم لە ژیاندا، بە نووسین یان هەر کارێکی دیکەوە سەرەنجام هەر تەریك دەبم. ئەستێرەی من رەنگە دوو سەد ساڵی تر بدرەوشێتەوە!، یان هەرگیز نەدرەوشێتەوە، پێموایە ئەستێرەکان کاریگەریی بەرچاویان هەیە لە هەڵکشانی بەختی هەر کەسێکدا، بۆیە هەمیشە یارم بە ئەستێرە پێناسە دەکەم لە شیعرەکانمدا.

خۆم: تۆ رەشبینی و پێکەنینت پێکەوە کۆکردۆتەوە، لەو

کاتەی دەبێت دڵتەنگ بیت تۆ پێدەکەنیت!.

من: بیرم نایەت کەی بوو گریام، ئەوانەی زۆر دەگرین یان گرفتارن بە خەمێکی زیاد لە پێویست گەورەکراوەوە یان کێشەی عەقڵییان هەیە، من هەر کاتێك پێدەکەنم مانای وایە ئازارێکم هەیە و بە پێکەنین بەرەو رووی دەبمەوە، کە گریانیشم هات یان تێکستێك لە دایك دەبێت یاخۆ کارەساتێکی گەورە دەقەومێت.

خۆم: هەمیشە نارازیت، نارەزایەتییەکەت لە شێوەی «پاسترناك»ە لەسەردەمی ستالیندا. ئەو رۆمانەکەی ناوی «دکتۆر زیڤاگۆ»یە، بەڵام ئەو رۆمانەی تۆ بەنیازیت بینووسیت ناوی «مۆتەکە»یە!. بەڵام ئەو لە سیاسەت، تۆ لە چی نارازیت؟.

من: لەگەڵ ئەوەی هیچ شتێك رازیم ناکات، شتێك نییە ببێتە مایەی دڵخۆشیم، جگە لەتاریکی هیچی ترم لێ دیار نییە، بەڵام تاکە وشەیەك هەیە رازیم دەکات، بەڵکو دڵشادیم پێ دەبەخشێت، رووناکم دەکاتەوە، ئەو وشەیەش «خۆشم ئەوێی»یە. بێ هیوا نیم، بەڵام مەستی ئومێد نیم، ئومێدەواریی نابێت ببێتە تریاك، بەشە باشەکەی ئەم جیهانە رەشبینەکان دروستیان کردووە، چوونکە خۆشبینەکان بە هەموو شتێك رازین، لەگەڵ هەموو بارودۆخەکاندا خۆیان دەگونجێنن. لە ریشەوە حەزم بە چارەی ئەو مرۆڤانە نییە بێ ئەوەی چرا دیار بێت، گۆرانی بۆ رووناکی دەڵێن.

خۆم: تۆ چیرۆکت زۆرە بۆ گێڕانەوە، وەك ئەو پیاوەی

«ترۆتسکی» کوشت، بەڵام پێش مردنی، ترۆتسکی وتی، ئەو پیاوە نەکوژن چوونکە چیرۆکێکی هەیە بۆ گێڕانەوە، ئێمە داوا لە کانسەر دەکەین نەتکوژێت تاکو چیرۆکە بێ بنەکەت بگێڕیتەوە.

٢٠١٨-١١-١١

کاتژمێر: دوانزە و بیست خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-٦-

من: لەگەڵ «ئالان بادیۆ» هاوڕام لەوەی پێویستە خۆشەویستی سەرکێشانە بێت، پڕ بێت لە ڕیسك، لەوەشدا هاوڕام پێچەوانەی بەشێکی بەرفرەی فێمینستەکان بیر دەکاتەوە کە فەلسەفەی کاریان بریتییە لە دوورخستنەوەی هەر دوو ڕەگەزا!. ئەی کەواتە لە چیدا ناتەبام؟. لەوێدا ناتەبام خۆشەویستی لە کردە و چێژی سێکسیی جیا دەکاتەوە و پێیوایە خۆشەویستی لە ژێر «هەڕەشەی» هیدۆنیزم و لیبرالیزمدایە، ئەو هەڕەشەیەی ئەو دەیبینێت سەد لە سەد ڕاستە، بەڵام ئەو ڕوانگەیەی پێیوایە دوانەی خۆشەویستی و سێکس ناتەبان لەگەڵ یەکتر تەنها وەهمە.

خۆم: ئەوەی هەمیشە جێگەی تێبینیمە دوانەی «خۆشەویستی و سێکس» لە لای تۆ پێکەوە بەستراون، یان هەوڵ بۆ ئەوە دەدەیت، ئارگۆمێنت بهێنێتەوە تاکو بیسەلمێنیت هیچکامیان بێ ئەویتر بوونی نییە!. ئەوەی لە بیرت کردووە،

ڕەهەندە ڕۆحییەکەی خۆشەویستییە.

من: ڕۆح لەلای من تەنها زاراوەیەکی ناو فەرهەنگی زمانەوانییە و لە هەر کوێدا باسی بکەم جیاواز نییە لە جەستە. پێچەوانەی ئەو دیدە ئەفلاتۆنییەم مرۆڤ بە کائینێکی دوالیزمی پێناسە دەکات و دابەشی دەکات بەسەر جەستە و ڕۆحدا، ڕۆحیش تەوزیف دەکات بەسەر بیر و ویست و حەزدا.

خۆم: جەستە تەنها قەباغێکە کە ڕۆح هەڵیدەسوڕێنێت، ڕۆح نەمرە، کەچی جەستە بۆ ماوەیەکی کورت دەژی!!. نادیدە گرتنی ڕۆح ئەو بە شتبوونەوەی مرۆڤی لێدەکەوێتەوە سیستمی سەرمایەداریی هەرمێنی پێداوە.

من: هیچ کات نامەوێت داکۆکی لە سەرمایەداریی بکەم، بەڵام بابەتی ڕۆح و جەستە، کێشەی فەلسەفەوە بووە لە هەر سێ قۆناغەکەی مێژووی فەلسەفەدا «فەلسەفەی کۆن، فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست، فەلسەفی نوێ». مارکس پێیوایە مرۆڤی پریمتیف کە توانای ئەنالیزەی خەونەکانی خۆی نەبووە، گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی ژێدەری ئەندێشە و هەستی، خودی جەستەی نییە، بەڵکو بەستوویەتی بەو ڕۆحەی لە ناو لەشیدا جێگیر بووە و پاش مردن بەجێی دەهێڵێت!. وەك خۆی دەڵێت: بەم جۆرە بیردۆزی نەمریی ڕۆح سەری دەرهێناوە.

خۆم: مەبەستم ئەو جۆرە ئایدیالیزمە ئەفلاتۆنییە نییە، ڕۆح و جەستە، وەك دوو شتی جیاواز پێناسە دەکات، بەڵکو مەبەستم ئەو هەستەیە کە دەتوانێت خۆشەویستی لە خۆ بگرێت، بەبێ بەریەککەوتنی جەستەکان.

من: ئەو هەستە هەر لەناو خودی جەستەدایە، لای ئەریستۆ مردنە فیزیکییەکە مردنی رۆحیشە، کە بۆدییەکەی مرۆڤ لەناو چوو، شتێك نامێنێت بە ناوی رۆح یان دەروون، چوونکە هەموو گرێدراوی جەستەن، بەڵام بیرۆکەی نەمریی رۆح پرسێکی ئاینییە بەتایبەت تێمای فەلسەفەی لاهوتیی سەدەکانی ناوەڕاست بووە، کە لەسەر سترۆکتۆری کریستیانیزم دامەزراوە، بۆ نموونە «تۆماس ئەکوینی» جەختی لەسەر نەمریی رۆح دەکردەوە، هەڵبەتە ئەمە هەمان ئەو قسەیە بوو «کتێبی پیرۆز» پێشتر پێداگریی لەسەر کردبوو.

خۆم: ئارەزوویەکی سەیرت تێدا دەبینمەوە بۆ تۆمەتبارکردنی هەر چەمکێك لەگەڵ ئایدیای خۆتدا نەیەتەوە.

من: من کاتیگۆرییەکان نیشان دەدەم، راستی شتەکان ئەنالیزە دەکەم بێ هیچ تۆمەت و بڕیارێکی پێشوەخت.

خۆم: هەندێك پارادۆکس لە بیرکردنەوەتدا بە روونی و زەقیی دیارە، هاوسەرگیریی رەد دەکەیتەوە، بانگەشەش بۆ خۆشەویستی دەکەیت!!، خۆشەویستی دەبەستیتەوە بە سێکس و چێژ، کەچی ژیان بە شتێکی پووچ لێکدەدەیتەوە!!.

من: راستە لە ژیانی کۆلێکتیڤ دەسڵەمێمەوە، هەمیشە جەنگێکی نێوخۆیی لە مێشکمدا بوونی هەیە، جەنگێك بێ دووکەڵ و بارووت کە هیچ کەسێك نایبینێت جگە لە خودی خۆم، پڕم لە ڕاڕایی و پەشیمانبوونەوەی فیکریی، من بە پێی کۆنتێکستێکی مێژوویی دیاریکراو بڕیارم لەسەر نادرێت. بۆ

بڕیاردان لەسەرم، دەبێت لە هەموو ئەو جەنگانە تێبگەیت لە سەرەتاوە تاوەکو ئێستا دژی خۆم کردوومن. هێندەش سەیرە ئەوەی لەسەری ڕاڕا نیم و بێ گومان و پرسیارکردن خۆم داوە بەدەستییەوە خۆشەویستییە، بێ ئەوەی بزانم ئەم کەشتییە وێڵە دەمگەیەنێتە چ کەنارێك، من ئامانج و خەونم کەنار نییە، گرنگ ئەوەیە تاکە سەرنشینی کەشتی خۆشەویستی ژنێك بم. خەونەکە زۆر گەورەیە، وا نییە؟.

خۆم: زۆربەی جار، بێ ئومێدیی و ڕەشبینیت لە پلەیەکدایە، ناتوانم بڕوا بەخۆم بکەم خەونێك یان ئامانجێکت هەبێت. تۆ خۆشەویستی بەکاردەهێنیت بۆ ئەوەی بە ئاسوودەگی بمریت. شتێك بە شەفافی ببینم ئەوەیە لەپێناوی خۆدزینەوە لە مردن خۆت داوە بە دەم شەپۆلی خۆشەویستییەوە. ڕەنگە ئەم ڕێسایەکی نەگۆڕی خۆشەویستیش بێت.

من: زۆربەی منداڵانی ماڵە دەوڵەمەندەکان لە خەونبینین و ئامانجدا هەژارن، ئەمە تێزێك بوو منی نەگرتەوە!، ئێستاش کە هەژاریی وەك قرشێك لاشەم دەخوات، خەونەکانم بە گەورەیی ماونەتەوە. لەوەتی هەم خەونی گەورە گەورە دەبینم، بەڵام بە هەنگاوی بچووك بەرەو هێنانە دی ئەو خەونانە دەچم. ئەگەر پێم بڵێیت کامە خەونت لە هەموویان گەورەترە؟ بێ دوو دڵی دەڵێم خۆشەویستی. زاناکانیش دەڵێن مێشك دەزگایەکە بۆ دەستنیشانکردنی ئامانج، لە مێشکی مندا پێشنۆرەترین ئامانج تەنها خۆشەویستییە.

خۆم: ئەو خەون و ئامانجانە بەلا گەورەکەی مرۆڤن،

ئێستا تێدەگەم هەموو مرۆڤێکی رەشبین، خەونێکی تێکشکاوی هەیە، لە پشتی هەر مرۆڤێکی نائومێدەوە چیرۆکێکی حەزین هەیە.

من: رەنگە پیر بووبین بە دیار خەونەکانمانەوە، بۆیە هەمیشە بە نوستالیژیاکانمان دەژین. قسە باوەکە دەڵێت «پیر لەسەر رابردووی دەژی و گەنجیش بە چاو برینە داهاتوو». وەك خۆم لە سەرەتاوە بە گڕ و تینەوە کارم بۆ ئاینندە دەکرد، ئاینندەیەك دنیایەکی جوان و پڕ خۆشەویستی لە رەحمیدا هەڵگرتبێت و لە دایك بێت. ئێستاکە لەو ئاینندەیەدا دەژین و دەبینین دنیا هەر هەمان دنیا ناشرینەکەی پێشووە کە ئەو هەموو رەنجەمان دا لەپێناوی گۆڕینی. وەلێ لەبری گۆڕانی دنیا، رووخساری خۆمان گۆڕاوە، چرچی تەمەن لەسەر پێستمان دەرکەوتووە.

خۆم: گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی ئەم ژیانە زۆر پووچە، چوونکە گەمژەکان بڕیاری لەسەر دەدەن و جەلادەکان هەڵیدەسوڕێنن.

من: زۆر جار دەگەمە ئەو حەزەی «راینمارك» کە وای دەبینی جیهان پێویستی بە شەڕێکی گەورەیە لە نێوان خواکان و ئەهریمەکاندا کە تیایدا خوداوەندەکان بگلێن و جیهان تاریك دابێت لە پێناوی لە دایکبوونەوەی جیهانێکی نوێدا. ئەمە بیرۆکەیە هێندە سامناك بوو، نازیزم وەك میتۆلۆژییەکی نوێی ژێرمەنی بۆی دەگەڕایەوە، بەڵام خەریکە دەبێتە ئارەزووی منیش.

خۆم: بیرۆکەکەت ترسناکە، سەیرە مرۆڤ هەمیشە بە

داهێنانی نوێ ژیان تاڵتر دەکات!، ڕەنگە مرۆڤ تەنیا توانای مەشقکردنی لەسەر وێرانکاریی هەبێت نەك دامەزراندنی ژیان و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە مەرگ.

من: کێشەکە ئەوەیە هێشتا مرۆڤ پێناسەی بۆ ژیان نییە و دەیەوێت لە مردن تێبگات!!. ڕاستە تێنەگەیشتن لە مەرگ تۆقێنەرە، هەروەك «پاسکاڵ» دەیووت «ئەوەی لە هەموو شت زیاتر بێ ئاگام لێی و نەشارەزاترم لەسەری ئەو مەرگەیە لە چنگی ڕزگارم نابێت». ئێستاکە دەمەوێت ژیان بەو هەنگاوە پێناسە بکەم لاقم بەرەو خۆشەویستی دەبنێ، ئیدی کاتم نییە بۆ بیرکردنەوە لە مەرگ، مادام هێشتا لە نێو دڵی ژنێکدا بوونم هەیە.

خۆم: هەروەك زەوی هێزی کێشکردنت هەیە، ئەوەی بە سوپایەك نەدەکرا تۆ کردت، کلیلی ئەو قوفڵەت دۆزییەوە، چەندان ساڵ بوو ژەنگی دڵی مردووم گرتبووی!!.

من: هێزێکی سەیر لە خۆمدا بەدی دەکەم، دەتوانم کاریگەریی لەسەر بەرامبەرەکەم دابنێم، وەك تسۆنامییەك وام هیچ هێزێك ناتوانێ ڕامبگرێت، هەرچی ناخۆشی سەر ڕێگای ژیانمە لەگەڵ خۆمدا ڕایدەماڵم، کەچی ژنێك لەهەستی خۆیدا ڕایوەستاندم!! بەهێزی خۆشەویستی ڕایگرتم، ئێستا وەك پەیکەرێك لە بەردەمیدا ئیستم گرتووە و چەقیوم. سەیرە!!.

٢٠١٨-١١-١٤

**کاتژمێر: چواردە و دە خولەك**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

-٧-

خۆم: عاشقەکان هەمیشە شاعیرن، بەڵام مەرج نییە هەموو کات شاعیرەکان عاشق بن. پەیوەندیی نێوان شیعر و خۆشەویستی، وەك پەیوەندیی نێوان ئۆکسژین و هەناسەدان وایە.

من: نەك هەر شیعر بەڵکو لێکۆڵینەوەژاپۆنییەکان ئەوەیان دەرخستووە موزیکیش هۆکارێکە بۆ کەوتنە ناو پرۆسەی خۆشەویستییەوە، من شیعر وەك بەشێك لە موزیك دەبینم، شیعر زمانی هەستەکانمانە، لەبەرئەمە هەمیشە عاشقەکان وشەکانیان هێندە ناسکە شیعرییەتی لێ دەچۆڕێت.

خۆم: شیعرەکانت جیهانێك لە خۆشەویستی رۆدەنێن، زۆربەی جار ئەم جیهانە وەك یۆتۆپیایەك دەبینرێت، هەمیشە ریتمی شیعرەکانت جۆرێکە وەك ئەوەی حکایەتێك بۆ ئێمە بگێڕیتەوە، زۆر خودی و سایکۆلۆژییانە شیعر دەنووسیت، ناتەوێت پێناسەی هیچ شتێك بکەیت لە دەرەوەی عەشق، عەشقیشت لە ئەزموونی خۆتدا کورت کردۆتەوە، پێموایە هەموو جیهانی شیعری تۆ، جیهان و ئەزموونی سۆزداریی خۆتە.

من: ئەو شیعرانەی بۆ خۆشەویستی نوسیوومن هەموو خەونی بەدینەهاتوون، زۆر جار ئەمە لە شێرپەنجە زیاتر ئازارم دەدات!، چون جیهانێکم لە شیعردا بەتایبەت لەگەڵ مەعشوق دروستکردووە کە تەنیا لە ئەندێشەی خۆم و جوگرافیای خەونە تاکەکەسییەکانمدا هەیە. هێشتا نازانم

مەعشوق ئەو جیهانە بە هەموو تانوپۆکەیەوە قبوڵ دەکات؟.

خۆم: ئەو جیهانە بێگەردە هەرگیز رەت ناکرێتەوە، هۆکارێك نییە بۆ گەوارنەکردنی ئەو خەونە رەنگاڵییانە.

من: گرفتەکەم ئەوەیە زۆر قووڵم لە خەون بینیندا، پێموایە جیهانی ناو خەونەکانم سبەی دەبێتە واقیع و کەسێك دەتوانێت ئەو جیهانە قبوڵ بکات!. لەگەڵ ئەوەشدا نایشارمەوە تا ئێستا شیعر فریام نەکەوتووە، بەڵکو تیغی زیاتری تێکردووم!، ئیدی هەموو کات دەڵێم چیدی شیعر نانووسم، بەلاّم بێ ئەوەی هەست بە خۆم بکەم دەبینم دیسانەوە خەریکی نووسینی شیعرم. جیهانی من لەناو خەون و دنیای مەجازیی شیعردایە.

خۆم: کەواتە مافی ئەوەمان هەیە بڵێین تۆ دنیایەکی راستەقینەی خۆت نییە، یان ئەگەریش هەبێت تاکو ئێستا کەس نەیتوانیوە راڤەی بکات؟.

من: دروستە وایە، کەس ئازایەتی ئەوەی نەبووە، سەرکێشی بکات و بێتە ناو جیهانە ئاڵۆز و جەنجاڵەکەمەوە. سەیرتر لەوە خەڵکانێك هەن گرەو لەسەر کڕینی خۆم و دنیا یۆتۆپییەکەم دەکەن، ئەوان زۆر گوناهن چوونکە تێناگەن هیچ کات ناخرێمەوە مەزادەوە و نرخم لەسەر دانانرێت. تا ئێستا کەس جورئەتی نەبووە بمخاتە گیروگازی کڕین و فرۆشتنەوە. ترسناکییەکەش ئەوەیە هەنووکە دەخوازم ئەو جیهانە، بەسەر خۆمدا وێران و خاپوور بکەم و ئەم گەمە سەخیف و پووچەی ژیان لێرەدا کۆتایی بێت.

خـۆم: جیهانی تـۆ، جیهانێکی دوالیزمییە، لەسـەر چێژ و ئارەزوو لەلایەك و سەرکێشی و یاخیبوون لەلاکەی تر، بونیاد نراوە!!، کۆکردنەوەی ئەو دووانە هەم نامۆ خۆی دەنوێنێت، هەم زۆرینەی کەس تەنیا دەتوانن بەشێکی قبوڵ بکەن!.

من: من بەش بەش ناکرێم، کەس ناتوانێت من لە خەون و ئارەزووەکانم جودا بکاتەوە، هەر کەس بەو نیەتە بێتە ناو جیهانەکەمەوە، نەك فەزیڵەت نییە بۆی، بەڵکو هەوڵیداوە بۆ تیرۆرکردنیشم.

خۆم: دەگەڕێمەوە سەر باسی شیعر، وتت شیعر فریام نەکەوتووە، ئەوە بە پێچەوانەوە دەبینم، لەبەرئەوەی تەنیا شیعر فریات کەوتووە! ئەو کاتانەی نەتتوانیوە راز و ئازاری ناخت بۆ کەسێك باس بکەیت، شیعر وەك فریادڕەسێك هاتووە بۆ لات، ئەگەر نا ئەو هەموو ژانەی نێو ژیانت دەمێك بوو لە ناویان بردبوویت.

من: شیعر وەك دەرمان نابینم، لە شیعردا داستانی خۆم دەگێڕمەوە، کاتێك باسی خۆم دەکەم، مانای ئەوە نییە لە بارەی خودی خۆمەوە دەدوێم، نا، باسی ئەزموونی خۆم لەتەك عەشق دەکەم، هەمیشە بەڵێنی ئەوە بە مەعشوق دەدەم، پرچی تەڕترین شیعری بۆ دابهێنم، هەر ئەو شیعرانە دەبنە یادگاریە شیرینە پڕ ئازارەکانی ژیانی، هەرچەند ئەوەی لە مندا هەڵدەقوڵێت بە چارەگێکی نەهاتۆتە دەرێ.

خـۆم: وتـت بـاسی ئـەزمـوونی خـۆت دەکـەیـت لـەگـەڵ خۆشەویستی، لەگەڵ ژنێك لەنێوان وەهم و هەقیقەتدا،

ئەمانە هەوێنی شیعری تۆن، بەڵام ئیدی کە شیعرەکانت دەگەنە خوێنەر، تۆ دەمریت، هەموو خوێنەرێك مافی هەیە وا تێبگات باسی جیهانی ئەو دەکات، یان خەونەکانی ئەو راڤە دەکەیت.

مـن: لـە بـڵاوکـردنـەوەی هـەنـدێك لـە نـووسـینـەکانـم پەشیمانم، وەها تێدەگەم منێکی تر ئەو دەقانەی نوسیوە، باوەڕم بە رەوشی دیالێکتیکیی سروشت و زیندەوەران هەیە، کە هەمیشە فۆرمیان دەگۆڕێت و بەرەو پێشەوە دەڕوات و نوێ دەبێتەوە، منیش وەك زیندەوەرێك بەدەر نیم لەم رێسا دیالێکتیکییە. لەگەڵ ئەوەشدا نامەوێ خوێنەر بمکاتە موڵکی خۆی، ئاخر خۆ ناتوانم دابەش بم بەسەر مەعشوق و چەند کەسێکی تردا، من خۆشەویستی ئەوم هەڵبژاردووە، ئەویش ژیانی بێ بەهای من.

خـۆم: ئەمە چیرۆکی «پۆسـیدۆن»ی بـرای «زیـۆس»م بیر دەهێنێتەوە، کە خـودای دەریـاکان بـوو، ئـەو لـە قـووڵایی دەریاکاندا دەژیا نەك لە ئۆڵۆمپیاد، هەموو دەسەڵاتێکیشی هەبوو بۆ زریان هەستاندن و هێورکردنەوەشی، هەندێك جار بە سێ ئەسپ بەسەر شەپۆلەکانەوە پیاسەی دەکردا!. دەبێت عاشق وەك پۆسیدۆن تەنیا «ئەمفیتریتی»ی کچی خودای دەریاکان بکاتە شازادەی کۆشکە ئەفسووناویەکانی نێو قووڵایی دەریای ئەوین. عاشق دەبێت لە خۆشویستندا بگاتە قووڵایی ئۆقیانووسی هەست، باوەڕم بە لوتکە نییە لە عەشقدا، بەڵکو بڕوام بە نغرۆبوونە لە یەکێکی تردا، دەبێت

وەك پۆسیدۆن یان کەشتییەکی نقومبوو، لە قووڵایی دەریای دڵی مەعشوقدا بژیت، نەك بەسەر پشتی شەپۆلەکانەوە بێیت و بچیت.

من: داستانێکی سەرسوڕهێنەر هەیە لە بارەی لەیلا و مەجنون!، وا دەگێڕنەوە رۆژێك «لەیلای عامری» شۆربا دابەش دەکات بەسەر پیاوانی هۆزدا، کاتێك نۆرە دەگاتە سەر قەیسی کوڕی ملەوەح «مەجنون»، لەیلا بەشە شۆربای پێنادات!!. پیاوانی هۆزیش بە تەوسەوە بە مەجنون دەڵێن تۆ ئاوها سەوداسەری لەیلا بوویت، کەچی ئەو ئامادە نییە کەوچکە شۆربایەکیشت پێبدا!، ئەمە چ جۆرە عەشقێکە؟. قەیس «مەجنون» لە وەڵامدا دەڵێت: لەیلا بەو کارەی منی لە هەمووتان جیاکردەوە. دروست عەشق ئەو جیاکردنەوەیەیە، تۆ کەسێك لەنێو ملیارەها مرۆڤی تردا جیا دەکەیتەوە!. رەنگە لەم بابەتەدا بۆچوونێکی سۆفیستانەشم هەبێت، پێموایە مرۆڤەکان ناتوانن عاشق بن، تاوەکو هەزاران ساڵ رۆحیان ئاشنای یەکتر نەبووبێت!، لێرەدا قسە لەسەر تەمەن نییە، بەڵکو باوەڕم بە دۆنادۆنی گیانەکانە بەدەر لە بوعدە ئاینییەکەی ئەم پرسە، لەگەڵ ئەمەشدا عەشق ئەو نەریتە مازۆخییە نییە لە رۆژهەڵاتی دنیادا باوە، ئەو لیبرالیزمە سێکسییەش نییە لە جیهانی خۆرئاوادا دەبینرێت.. ئەو عەشقەی من لە بارەیەوە دەدوێم کەوتۆتە نێوان هەردوو دیاردەکەوە.

خۆم: نابێت عاشق هەست بە تەنگەبەری بکات لە جیهانی

مەعشوقدا، دەبێت ئەو هەستە هێندەی گەردوون بەرین بێت بۆ ژیانکردنی، هەروەك لە ئەفسانە «گورجستانی»یەکەدا هەیە: زاوای خۆر لە پاش گەڕانەوەی لەلای دایکی فەرمانڕەوا لە دنیاکەی تر، لە کاتی تێپەڕین بەلای ژن و پیاوێك کە لەسەر دەمی تیژی تەورێك درێژ ببوون، پرسیاریان لێ دەکات و ئەوانیش دەڵێن زۆرمان دیون بە ئێرەدا رەت بوون بێ ئەوەی بگەڕێنەوە، ئەگەر گەڕایتەوە پێتدەڵێین بۆچی لەسەر دەمی ئەم تەورە درێژ بووین، کاتێك زاوای خۆر دەگەڕێتەوە، ژن و پیاوەکە پێی دەڵێن «ئێمە لەو دنیا ئەویندارى یەکتر بووین، لێرەش وەك ئەولا بە دڵی یەکتر گونجاوین، تەنانەت لەسەر دەمی تیژی تەورێکیش جێمان دەبێتەوە بە مەرجێك لێك دانەبڕێین و هەرگیز یەکدی لە دەست نەدەین». کەچی ئەمڕۆ خۆشەویستەکان لە کیشوەری دڵی یەکتردا جێگەیان نابێتەوە، دنیای عەشق ئاوەژوو بۆتەوە!، وەختە بڵێم جاران زەوی بەدەوری خۆردا دەورانی دەکرد، ئێستاش خۆر بە مەمنونییەوە بە چوار دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە.

من: من و تۆ وەك ئەوەی پاشماوەی خەڵکی بناری «ئارکادیا» بین، زۆر پاکیزانە لە خۆشەویستی دەڕوانین.، لێ ئەم چاخە، چەرخی هەرەسهێنانی خۆشەویستییە، کەچی ئێمە وەك ئەو سەربازە ژاپۆنییانەی کاتی جەنگی جیهانی دووەم، پاش کۆتایی جەنگیش لە دارستانەکاندا مانەوە و خۆیان رادەست نەکرد، دەستمان گرتووە بە چەمکی عەشقەوە. هەر ئەمە ئێمە جیا دەکاتەوە لەو حەشاماتەی دەژین و دەمرن بێ ئەوەی بە قووڵی

نەفەسێك خۆشەویستیان هەڵمژبێت.

خۆم: مرۆڤی هاوچەرخ، عەشق وەك بەشێك لە فۆلكلۆر دەبینێت، پێیوایە زەمەنی خۆشەویستی لە سەردەمی دیجیتاڵدا بووەتە بەشێك لە کەلەپوور کە دەبێت لە مۆزەکاندا هەڵبگیرێت. مرۆڤایەتی فێری ئاکاری دەستبازیی بووە، لەناو ئەو رەوشتەشدا جێگەیەك بۆ خۆشەویستی بوونی نییە، بەڵکو ئەم ئاکارە بەهەموو شێوەیەك دەستدرێژیی دەکاتە سەر عەشق، لە سایەی فرەیی سێکسیی و پەیوەندیی میکانیکیی بێ رۆحی نێوان هەردوو رەگەز، خۆشەویستی ئەتك بووە.

٢٠١٨-١١-١٨

کاتژمێر: نۆ و چل و پێنج خولەکی بەیانی

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-٨-

من: بەبڕوای خۆم گرنگ بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ و جوانە، نەك رووخساری جوان، ئاخر بیرکردنەوەی جوان ئەزەلییە، هەرچی رووخساری جوانیشە کاتی و ناجێگیر. وەك خۆم لە بیرکردنەوەدا تۆ دەبینم، رووخسارتم زۆر بۆ گرنگ نییە، هەمیشە جوانی رێژەییە، بەڵام جوانی بیرکردنەوە دەکەوێتە دەرەوەی ئەو تیۆرە. مرۆڤ بەمێشکی دەتوانێ بگاتە جوانی و رەهەندی ون و ئیستاتیکی بیرکردنەوەی کەسێکی دیاریکراو، چاو لەم بوارەدا رۆڵی نییە یان کەمترین رۆڵی هەیە.

خـۆم: کێشـەکە مـرۆڤی ئێـمـەیـە، پـیـاوی کـورد ژن وەك جەستە دەبینێت، لە بەرامبەریشدا مێینە وێنای پیاو وەك گورگێك دەکێشێت. ئەمەش سوچی ژن یان پیاو نییە وەك تاکەکەس، بەڵکو تاوانەکە لە ئەستۆی سیستمی پاتریارکییە.

من: پیاوی ئێمە «واتە پیاوی رۆژهەڵاتی- الشرق» هەمان سەگەکەی پاڤلۆلە، کاتێك گوێی لە سەدای ژن یان دەنگی هەستی دەبێت خێرا لیکێکی سێکسیی بە شەویلگەیدا دێتە خـوارەوە. ژنی ئێمەش پیاوان لە شێوەی مافیاکانی فرانك کۆستێلۆ دەبینن کە بێ ویژدانانە جوانیان دەکرۆژن و جەستەیان تاڵان دەکەن و چێژیان لێ دەدزن.

خۆم: کەواتە ژن و پیاو مەحکومن بە خۆشەویستی یەکتر. پێویستە ئامادە بن لەگەڵ یەك وەك توخمی جودا بەرەو یەك چارەنووس برۆن. ئارتەر رامبۆ لە دێرە شیعرێکدا دەڵێت: پێویستە سەرلەنوێ خۆشەویستی داهێنینەوە. لەو دنیای بێ رەنگەی خۆشەویستی تێدا نەماوە، وەرە با ئێمە پێکەوە مەشخەڵی خۆشەویستی هەڵبگرین.

مـن: ئـالان بـادیـۆ وای دەبـینـێت خـۆشـەویستی دووبـارە داهێنانەوەی ژیانە. هەموو رۆژێك لەگەڵ تۆ بە فۆرمی جیا جیا سەرقاڵی داهێنانەوەی ژیانم، مانای نوێ لەسەر جەستەی بە بەردبووی ژیان هەڵدەکۆڵم. ماندوو نابم، پیر نابم، تەنانەت نامرم تاکو بە خۆشەویستییەوە خەریك بم، ئاخر مرۆڤ تاکو خۆشەویستی بکات نە پیر دەبێت، نە دەمرێت. ئەمێستا هەموو بوونی خۆمم گرێداوەتەوە بە خۆشەویستییەوە،

هەروەك دێڕێك لە گۆرانییەکەی «جۆ داسین» دەڵێم «ئەگەر تۆ نەبوویایت، پێم بڵێ بۆچی من هەبم؟». ئێمە دەبێت پێکەوە ژیان دابهێنینەوە.

خۆم: لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێك لەسەروو خۆشەویستییەوە نابینم، بەڵام هێشتا لە گرێدانی خۆشەویستی و سێکس پێکەوە دەسڵەمێمەوە!!، پێموایە سێکس خۆشەویستی ناپارێزێت و نایگرێتە خۆی بەڵکو خاڵی کۆتایی بۆ دادەنێت.

من: ئەمە هەمان ئەو روانگەیەیە «ژاك لاکان» پێداگریی لەسەر دەکات، ئەویش پێیوایە خۆشەویستی و سێکس دوو پێدراوی دژ بە یەکترن، بەڵام دروست پێچەوانەکەی راستە، ئەگەرنا لەم کاتەدا خودی خۆشەویستی دەبێتە رەوشێکی سۆفیگەرانەی رووت!. خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو، سێکس واتاداری دەکات، چون سێکس تەنیا پرۆسەی منداڵ خستنەوە نییە، یان هەمان ئەو کردەیە نییە ئاژەڵەکان ممارەسەی دەکەن.

خۆم: خۆشەویستی زۆر جار سەرچاوەی گریانە، جەنگێکە لە ناوخودی خۆماندا، هیچ کات ئاسایش و جێگیریی لە خۆ ناگرێت، بەڵکو لە ئاکامدا بەختەوەرییەکی سەیری تێدایە کە تەنیا ئەوانەی خۆشەویستی دەکەن چێژ لەو بەختیارییە تاڵە وەردەگرن!!. دەشێت بڵێم بەختەوەریی خۆشەویستی لەوەدایە کەسێتییەکی مازۆخیمان بۆ دروست دەکات. هەموو عەزابەکانی نێو خۆشەویستی لە دواجاردا دەبنە

یادەوەریی شیرینی تەمەن.

من: خۆشەویستی ئەو یاقووتەیە هەموو کەس دەینێتە ژێر پێی، بەڵام من هەمیشە لەسەر تەوقە سەرم دامناوە!. خۆشەویستی ئەو جوانییەشە زۆرینەی خەڵك لە توێی داستان و کتێبەکاندا پێشوازیی لێدەکەن، یان پێیان خۆشە وەك دیاردەیەکی سینەمایی بیبینن و نایانەوێت خۆیان بچنە ناو ئەو یارییە ئاگرینەوە، بەڵام من خۆم پاڵەوانی ئەو داستانەم و ڕووداوەکانی بە دەستی خۆم تۆمار دەکەم، بە خوێنی خۆیشم کتێبی ئەو گەمە ئاگرینە دەنووسمەوە.

خۆم: مرۆڤی هاوچەرخ هێندە سەرقاڵە بە رووکاری دەرەوەی ژیان، هیچ کاتی نەماوە گوێ لە دەنگی ناوەوەی خۆی بگرێت. هێندەش سەرقاڵە بە ژیانێکی میکانیکییەوە، کاتی نییە لەو خەونانە تێبگات هەموو شەوێك دەیانبینێت.

من: بێگومان مرۆڤی زیندوو هەمیشە هۆکارێك بە ژیانەوە دەیبەستێتەوە، ئەویش توانای خەون بینینە! کارەسات ئەوەیە مرۆڤ خەونی نەمێنێت یان توانای خەونبینین لە دەستبدات، لەم چرکەساتەدا ژیان پووچترین کردەیە.

خۆم: بە پێی ئەفسانەکان خەون پرۆژەیەکە بۆ ئایندە، بە مانایەکی تر ئەوە خەونە پێتدەڵێت ژیان چی لە هەگبەدا بۆ هەڵگرتوویت و دەبێت بە دوایدا بڕۆیت!!. تەنانەت هەموو ئیپۆسەکانی خۆشەویستیش سەرەتا هەر خەونێك بوون.

من: ڕەنگە پێت سەیر بێت بڵێم لە خەونی سەرەتای مندا ژنێك هەبووە، تازە ناسیوومەتەوە!. خەون زمانێکی جیهانیی

هەیە و هاوبەشە لەنێوان تێکڕای مرۆڤەکاندا. وەك ئەریك فرۆم باسی دەکات: زمانی خەونی مرۆڤی سەرەتایی، یان زمانی خەونەکەی فیرعەون کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە، یاخۆ زمانی خەونی کەسێکیش لە شتوتگارت یا نیۆیۆرك بێت هەر یەك زمانن. زمانی خەونەکانی من شیعرن، لە دەرەوەی خەونیش ئەوەی بە خۆشەویستی ئەو ژنەوە دەمبەستێتەوە شیعریەتی ئەو خەونانەیە هەموو شەوێك دەیانبینم. فرۆم جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە هیچ نوستنێك بێ خەون تێناپەڕێت. زیادەگۆیی نییە بڵێم هەموو شەوێك خەونی پێوە دەبینم و بە زمانی شیعر دەیدوێنم.

خۆم: رەنگە ئەو ژنە لە دۆخێکی دۆشداماویدا بڵێت بۆچی دەبێت ئەو کەسە بم لە خەونەکانی تۆدام؟ ئەم رێکەوتە زۆر سەیرە. ناڵێم جێگەی بڕوا نییە، بەڵکو جێگەی سەرسوڕمانە!!.

من: بۆ خۆشم حاڵەتێکی ناوازەیە. بڕوام نەدەکرد کەسێك لە دووری دوورەوە هەموو شەوێك میوانی ناو خەونەکانم بێت، لەوە زیاتریش بەو خێراییە ببێتە بورکانی گڕگرتووی ناو مێشکم، هەرچی بنووسم باسی ئەو بکات، بۆ هەر کوێ بڕۆم لەگەڵمدا بێت، بیر لە هەرچی بکەمەوە بەو دەستپێبکات و هەر بە ئەویش کۆتایی بێت!!.

خۆم: زۆرجار زمان یان وتن وەڵامیان پێ نییە، تەنیا بێدەنگی وەڵامە پڕاوپڕەکەیە، نووکە هەم شۆك و هەم بێدەنگم لەبەرئەوەی نازانم چی بڵێم. کاتێك بەر هەندێك

راستی لەیادکراو و نەبینراو دەکەوینە دۆخی لاڵبوونەوە.

من: هەموو کات بیستنی هەقیقەت تووشی شۆکمان دەکات، لە سۆنگەی ئەوەی راستیی ئەوە نییە بە چاو دەیبینین، بەڵکو مێشك دەیناسێتەوە. تێدەگەم بە چیدا تێدەپەڕیت، لەگەڵ ئەمەشدا دووبارەی دەکەمەوە خەونی سەرەتام دواندنی ژنێك بوو بە زمانی شیعر، هەنووکە ئەو ژنە لە بەردەممدا وەستاوە و پڕ بە چاوەکانم نیگای دەکەم!.

خۆم: سەیرە! زۆر سەیرە!!. ئەمە رووداوێکی سەیری ژیانمە، لە شێوەی سەرسوڕمان و هەستم تێبگە.

من: خۆم پێشبینی ئەوەم دەکرد خۆم و خەونەکانم و قسەکانمی پێ سەیر بێت، ئەوەش جێی پرسیار بێت چۆن وا بە خێرایی بەرەو رووی چووم، بەڵام ئەمە بۆ من خەونێکی دێرینە و بۆ ئەویش رووداوێکی زۆر تازە!. ئەگەر لە دواکەوتنم بپرسێت، لە سەرەتاوە بەهۆی سیاسەتەوە خۆشەویستیم لە خۆمدا کوشت، ئێستا «سێبەری یۆنگ» بەسەرمدا زاڵ بووە و پێمدەڵێت ئەو دەمامك و خۆ بەهێزنیشاندانەت فڕێ بدە، خۆت بدە بە دەمی شەپۆلی خەونەکانتەوە کە رووەو یار دەتبات!. لە ئێستادا دڵخۆشم بەوەی خەونێکی مەزن و پێنووسێکم هەیە، لە کاتێکدا زۆرینەی خەڵك هیچی تریان نییە جگە لە گەدەیەکی گەورە و گیرفانێکی قووڵ.

خۆم: تۆ دەزانیت من ترسنۆکم بەرامبەر خۆشەویستی؟، تووشی نەخۆشی فیلۆفۆبیا بووم.

من: خۆشەویستی چالاکییەکی مرۆڤانەیە بەو پێیەی خۆشەویستی بەو تانوپۆوە تایبەتە بە مرۆڤ، بۆیە ئاساییە ترس و راڕایش لە ئارادا هەبێت. منیش تاکو ئەمڕۆ بەشێوەیەکی نارسیستیانە خۆشەویستیم کردووە!. هەموو دەزانین لە میتۆلۆجی یۆنانیدا نارسیسۆس ئەو گەنجەیە لە ئاوێکدا وێنەی خۆی دەبینێت و ئاشقی خۆی دەبێت. میلان کلاین پێیوایە نارسیسۆس کاتێك سەیری ئاوەکەی کردووە پێیوابووە سەیری جیهانی دەرەوە دەکات، لە راستیشدا خەیاڵی لای ئەو خۆشەویستە بووە ناسنامەکەی لە خۆیدا دۆزیوەتەوە. بۆیە هەمیشە وێنای ئەوم لە خودی خۆدا دۆزیوەتەوە.

خۆم: ناسینەوەی بۆ وا دواکەوت؟ چۆن و بە چیدا دەزانیت ئەو ژنەی ناو خەونەکانت ئەوە و یەکێکی تر نییە؟.

من: کات مەسەلەیەك نییە، گرنگ ئەوەیە ناسیمەوە و لەناو حەشاماتێك ژندا جیام کردەوە، لە مێژە دەستم بە گەڕان کردووە بە دوایدا، لە زۆر شوێن هاوشێوەی ژنی ناو خەونەکەم بەرچاو کەوتووە، لەسەر رێگام زۆر ژنی تر ویستویانە خۆیان بەو ژنە بناسێنن، بەڵام وەك رووبارێك لە رۆشتن بە دوایدا نەوەستاوم، ئەمێستا ئەو رووبارەی چەندان ساڵە بەرەو باوەشی دەریای ئەو بەڕێوە بوو، هێمن هێمن رژاوەتە ناویەوە، خۆی لەناویدا ون کردووە، تەنانەت وازی لە سروشت و ناوی خۆی هێناوە. دەستی لە هەموو شتێك هەڵگرتووە، تەنیا شوێن دۆزینەوەی ئەو خەونەی کەوتووە.

خـۆم: هیـچـم نییـە بـۆ وتـن، جگـە لـە واق وڕمـان بـە دیـار وشەکانتەوە. ئاخر دەکرێت لەم حاڵەدا چیم هەبێت بۆ وتن؟.

من: منیش وا هەست دەکەم خەون لەناو خەوندا دەبینم. تـۆ دیـقـەت بـدە هـەمـوو تـوێـژینـەوە زانـسـتـیـیەکانی فـرۆیـد لـە بـارەی سێکـسـەوەیـە، کـەچی خـۆی کـەسـایـەتـیـیـەکی شـەرمنی هـەبـووە، بـە رادەیـەك نـەیتوانیوە هـەستی تایبـەتی خـۆی بـۆ ئەو ژنە دەربـبـڕێت جێگەی سەرسامی بـووە. منیش لێ تێمای سـەرەکی نووسینـەکانم ژنـە، بـەڵام هـەمیشـە شـەرمێکم هـەیـە لە ژن، وا خەریکم لەگەڵ ئەودا بەسەر ئەو شەرمەدا زاڵ ببم، هـەوڵـدەدەم جڵـەوی خـۆم شـل بـکـەم، تـا دڵـم بـە دەنگی بـەرز قسەی بۆ بکات. دەمەوێت سەرنجی لەسەر زارم لاببەم کاتێك بۆی دەدوێم، بەڵکو خوازیارم هەست بە ترپەکانی دڵم بکات، چەندە خێرا لێدەدەن، چەند دەنگی لێدانیشیان بەرزە.

خـۆم: شـتـێـك هـەیـە لـە تـۆدا هـەرچـەنـد دەکـەم بـۆم راڤـە ناکرێت، تەنیا ئەوەندە دەزانم هێزی کێشکردنت زۆر هەراشە. ئەوەتا سێوی دڵی ئەو ژنە کاتێك لە داری بێزاریی بووەوە، لە بری بەرزبوونەوە بەرەو ئاسمانی غەمگینی، بەربووەوە ناو کۆشکی ئارامیی تۆوە. هەروەك جارێك ئەو ژنە پێی وتبوویت: بەدەر لەم فـاکـتـە کـە لـەسـەر خـۆم دەیـزانـم، دەمـەوێـت گـوێـم لـە دەنـگی هەستت بێت سەبارەت بە من!.

من: سـەرەتـا ژن وەك پارچەیەك لـە جوانی دەبـینـم، کەچی ئەو لەسەرو ئەو جوانییەوەیە، ئەم هەستەی خۆمم پێ ئەنالیز ناکرێت. پێشتر بە هەندێك شتم وتووە جوان کە زۆر لە خوار

جوانی ئەوەوە بوون، هەنووکە ناکرێت بە ئەم و ئەو شتانە وەك یەك و بە یەك ریتم بڵێم جوان، ئەو میتا جوانییە. هەندێك شتی بچووك هەبوون خۆشمویستوون، ئێستا ئەو بەو هەموو خۆشەویستییەوە لە وجودمدا هەیە، ناکرێت بە هەمان ئەندازەی ئەو شتە بچووکانە خۆشم بوێ، پێویستی بە میتا خۆشەویستییە. دەبێت شێوازێکی باڵا لە خۆشەویستی دابهێنم تاکو بتوانم پێی بڵێم بەو فۆرمە تایبەت و بێ وێنەیە خۆشم دەوێیت. ئەو لەسەروو جوانییەوەیە، منیش دەبێت لەسەروو خۆشەویستییەوە خۆشم بوێت.

خۆم: کەواتە بۆ ئەو هەستە بژی بەرامبەر بەئەو هەتە، بۆ بەردەوامی ئەم خۆشەویستییە مەمرە. لەبەرئەوەی لە چەندین وێستگەدا دەتبینم بەرامبەر مەرگ لاوازیت، دەبێت نەمریت تاکو حکایەتێکی گەورەی خۆشەویستی دەنووسیتەوە.

من: ئەوە ئارەزووی منیشە. جیا لەمەش ژیان کەی هێندە خۆشە بۆی بپارێمەوە و مەرگیش کوا هێندە سامناکە لێی بتۆقم؟، لەگەڵ ئەمەشدا بۆ خۆشەویستی و بە خۆشەویستی دەژیم. بیرت نەچێت زۆر ناخۆشی تر ماوە بیبینم کە لە مردن تاڵترن، بۆیە مەرگ ئەوەندە میهرەبان نییە وەها زوو بیێتە میوانم، لەگەڵ ئەوەشدا ژیان بەو تفتییەی خۆیەوە بە قەندی خۆشەویستی شیرین دەکەم.

٢٠١٨-١١-٢٢

کاتژمێر: دە و چارەکی بەیانی

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

ئەڵمانیا - بیلەفێڵد

-٩-

خـۆم: ئێمە لـە سـەردەمێکدا دەژیـن چـەرخی باڵادەستیی تەکنۆلۆژیایە، شێوەی خۆشـەویستی لە سەردەمی تەکنۆلۆژیا زۆر جـیـاوازە هـەتـا بـە بــەراوورد بـە سـاتـەوەختی بـاڵابـوونی شۆڕشی پیشـەسازیی. سـەیرە تا شارستانییەت پێشبکەوێت، خۆشـەویـسـتی کـەمتر دەبـێـتـەوە!! وەك ئـەوەی ئـەو دووانـە لەسـەر نەفیکردنی یەکتر وەستابن.

مـن: خـۆی شـارسـتـانی دیاردەیـەکی رۆمـانـسی نییە، بەڵکو لەسـەر سـترۆکتۆری دڵـڕەق رۆنـراوە. تۆ سـەیرێك بکە ئەوەی ئەوروپای هێنایە ئەمڕۆ شۆڕشی پیشـەسازیی بوو، ئەو شـۆڕشـە فینۆمینێکی ئیستاتیکی نـەبـوو، بـەڵکو لـەسـەر رەنجکێشانی چینی کـرێکار دروسـتـبـوو، هـەر ئـەو رەنـج و زەحمەتکێشـانە بـوو سـەرنـجی «مـارکـس»ی بـەلای خـۆیـدا راکـێشـا. بـڕوانـە بۆ زەمەنێکی دێرینتر و لە هەرەمەکانی میسر رابمێنە، کێ زیاتر کۆیلەی هەبووبێت و زەحمەتی زۆری خستبێتە ئەستۆیان، هـەرەمی ئـەو فیرعـەونـە گـەورەتـر و راقـیـتر بـووە، تـەنـانـەت باشتریش بەرگەی تێپەڕینی مێژووی گرتووە.

خـۆم: ئـەوەی لـە بیرت کـرد، کـرۆکی مـەبـەسـتـەکـە بـوو، ئەویش باسی پووکانەوەی خۆشـەویستی بوو لە چاخی زانست و تەکنۆلۆژیا، وەك ئەوەی خۆشـەویستیش بەشێك بووبێت لە پەرەسـەندنی قۆناغێکی مێژوویی ژیار، یان لەوانەیە لەژێر کاریگەریی بارودۆخێکدا وەك دایناسۆرەکان قڕی تێکەوتبێت.

مـن: تـەکـنـۆلـۆژیـا بـە قـەدەر رەهـەنـدە پـۆزەتـیـڤـەکـانی،

هەڕەشەیە و درندەشە.!، لە سایەی تەکنۆلۆژیادا مرۆڤ بەرەو ئامێر و رۆبۆتبوون هەنگاو دەنێت. ژیانی کۆلێکتیڤی مرۆڤەکان کەوتۆتە ناو دڵڕەقیی سندووقە بچووکە سیحرییەکەوە «ئایپاد و مۆبایل». رۆبۆت دەتوانێت رۆڵی میکانیکیانەی مرۆڤ ببینێت، بەڵام ناتوانێت چالاکییەکی مرۆڤانەی چەشنی خۆشەویستی هەبێت، ئەی ئەو کاتەی مرۆڤ بووبێتە رۆبۆت چۆن داوای خۆشەویستی لێ دەکەیت؟. خۆشەویستی لە سەردەمی تەکنۆلۆژیادا بووەتە ترادیسیۆنی هۆزە پریمیتیڤەکان، مەگەر لەناو خێڵەکانی ئەمازۆندا بیدۆزینەوە.

خۆم: تەنانەت پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیشمان کەوتوونەتە ژێر هەڕەشەی تەکنۆلۆژیا. دیقەت بدە لەو ئامێری پلەی ستەیشنە نوێیەی منداڵان کە هەر کام لە منداڵەکان دەتوانن لە ماڵی خۆیانەوە بەشێوەی بلوتوس لەگەڵ یەکتر یاری بکەن، ئەمە کارئاسانییە، بەڵام هەڕەشەشە، تەنانەت پێشبینی دەکەم دوای سەدەیەکی تر مرۆڤەکان نەتوانن لەمسی یەکتر بکەن، بە زمانی موبایلی زیرەك و ئامێرە تەکنۆلۆژییەکان نەبێت لە یەکتریش تێنەگەن!. لەم قۆناغەدا ئەوەی وەك کەلەپوورێکیش نەماوەتەوە بێگومان خۆشەویستییە.

من: دێرێك لە یەکێك لەو فیلمانەم بیر دێتەوە کە پاڵەوانی فیلمەکە دەڵێت «خودا لە دۆزەخەوە جوانتر دەبینرێت». ئێمە بۆ ئەوەی خۆشەویستی ببینین یان ممارەسەی بکەین، دەبێت بێینە دەرەوەی ئەو بەهەشتە دروستکراوەی زانست

و تەکنۆلۆژیا، بۆ ماوەکیش بێت خۆمان لە شەپۆلە کارۆ موگناتیسییەکان بشارینەوە، هەرچەند ئەمە ئەستەمە تۆ وەك پێکهاتە فیزیکییەکەت لە سەردەمی نانۆ تەکنۆلۆژییدا بیت، وەك بیر و دەروون لە قۆناغی پێش شۆڕشی پیشەسازیی.

خۆم: لەگەڵ ئەوەشدا تەکنۆلۆژیا و فیزیای کوانتۆم و نانۆ تەکنۆلۆژیی خزمەتێکی گەورە پێشکەشی مرۆڤ دەکەن، تۆ دەتوانیت لە رێی ماڵپەڕی «گوگڵ»ەوە هێندەی پەنجا ساڵ کتێب خوێندنەوەی باپیرت لە مانگێکدا زانیاریی بەدەست بخەیت، یان ئەو نەخۆشییانەی هێندەی جەنگی جیهانی یەکەم مرۆڤیان لەناوبرد، ئێستا بە هۆی تەکنۆلۆژیای نانۆوە چارەسەریان بۆتە ئاسانترین رێگا. ئەمە رووکارە پۆزەتیڤەکەی تەکنۆلۆژیایە کە نابێت بێ ویژدان بین لە باسکردنی.

من: بابەتەکە قێزکردنەوە و بوغز نییە بەرامبەر بە تەکنۆلۆژیا، قسە لەسەر کاریگەرییە نێگەتیڤەکانێتی کە دەتوانم بێ دوودڵیی بڵێم پترن لە رەهەندە پۆزەتیڤەکانی. ئێمە لە بارەی چەمکی خۆشەویستییەوە قسەمان دەکرد، هەر چۆنێك بێت تەکنۆلۆژیا بێ ئەوەی مەبەستی بێت، خۆشەویستی لەناو دەبات، ئەو شارستانێتییەی خۆشەویستی تێدا نەبێت، دەست بەسەر هەموو گەردوونیشدا بگرێت شارستانییەکی مردووە، تەنانەت ئەگەر مردن خۆیشی لەناو ببات!.

خۆم: باس هاتە سەر مردن. خولیای نەمریی و گەڕان بە دوای نەمریدا، هەمیشە خولیایەکی دێرینی مرۆڤ بووە،

نەمربوون مێشکی مرۆڤی سەرەتایی سەرقاڵ کردبوو، هەروەك چۆن مێشکی مرۆڤی مودێرنیش بەدەر نییە لەم ویستە. کەچی شتێك مرۆڤی نوێ لە میتۆلۆجییە بابلییەکە جیا دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە لەو ئەفسانەیەدا «گلگامێش» دوای مردنی «ئەنکیدۆ»ی هاوڕێی خۆشەویستی، بە دوای نەمرییدا دەگەڕێت!، کەچی ئەو هەموو مەرگە لە چوار دەورماندا وامان لێناکات بە جیددی و بە پاڵپشتی تەکنۆلۆژیا بیرێك لە نەمریی بکەینەوە.

من: مرۆڤی هاوچەرخ بیر لە ژیان دەکاتەوە، چوونکە کاتی نییە بۆ بیرکردنەوە لە نەمریی، تەنانەت هێندە خەریك کراوە بە چەرمەسەرییەکانی ژیانەوە، بەسەر ئەوەدا باز دەدات کە ژیان لەناو خۆیدا تۆوی مردنی هەڵگرتووە. جیاواز لەمەش هیچ کەسێك ناتوانێت مەرگ لە خۆیدا کەشف بکات.

خۆم: پێموایە مرۆڤی هاوچەرخ چارەسەرێکی تری دۆزیوەتەوە، ئەویش هەوڵدانە بۆ نەمرییەکی ڕەمزیی، نووسەرێك لە کاتی نووسینی کتێبێکدا دەیەوێت لەو ڕێگەیەوە خۆی بۆ کاتێکی درێژ بە زیندوویی بهێڵێتەوە، ئەمەش بە روونی لە چاوپێکەوتنێکی «ژاك دریدا» لە کاتێکی نزیکی مەرگیدا ڕەنگیداوەتەوە کە ئەو هەستەی تێدا بەدی دەکرێت خوازیارە بەو فۆرمە ڕەمزییە نەمر بێت. جیا لەمەش ئەوەی جێی سەرنجە نقومبوونی مرۆڤە لە ژیاندا!.

من: ئێمە تاکو لە مەرگ تێنەگەین توانامان نییە تەفسیری ژیان بکەین، ئەمە هەمان وەزیفەی فەلسەفەشە لەکن

پلاتۆ، بەو پێیەی لە دیدی ئەودا فەلسەفە واتە توانای تێگەیشتن لە مەرگ، بەڵام درێدا خۆی وەها دەبینێت مادام لە مەرگ تێنەگەیشتووە هێشتا فێری هونەری ژیانکردن نەبووە!. دەکرێت وەك شاعیرە ژاپۆنییەکە بڵێم خودی «ژیان بە پێی نزیکبوونەوەمان لە مردن، دەدرەوشێتەوە».

خۆم: ئەو هەستەم هەیە سەبارەت بە تۆ، کە خۆی لە دوو فۆرمی جودا دەبینێتەوە، فۆرمی یەکەم، مەشقکردنە لەسەر ئەوەی مردن وەك دیاردەیەکی ترسناك بەڵام حەتمی قبوڵ بکەیت. فۆرمی دووەم، کارکردنتە لە بواری نووسین بۆ ئەوەی لەو رێگەیەوە خۆت لە نێو زیندووەکاندا بهێڵیتەوە بۆ هەمیشە.

من: نەخێر بەو جۆرە نییە. من پێویستم بە پەلەکردنە، شتێکی سەیر سەرنجی راکێشاوم، تا ئەو کاتەی گەنجیت و وزەت زۆرە بۆ نووسین، دەبێت بە خوێندنەوەوە سەرقاڵ بیت و هەوڵبدەیت هیچ نەنووسیت کە تەمەنیشت هەڵکشا ئەو سەرمایەیەی بە ئەزموون و خوێندنەوە پاشەکەوتت کردووە وزەت نییە بۆ نووسینەوەی!. بەڵام من وا ناکەم چی فێر بووم بە زوویی دەینووسم، ئەمە راستیی منە. دەمەوێت شتێك هەیە بیگەیەنم، نازانم بە کێ؟ بەڵام دەزانم دەبێت ئەو پەیامەم بگات!.

خۆم: کەواتە تۆ بۆ خەڵك دەنووسیت، وا نییە؟ بەڵام خەڵك هەمیشە گوێ بۆ زۆربێژیی دەسەڵاتداران دەگرێت.

من: بۆ ئەو بەشە لە خەڵك دەنووسم بیر دەکاتەوە،

ئەگەرنا خەڵکم بۆ گرنگ نییە، چون خەڵك هێندە باش نین، تاکو ترسم لە رقیان بێت، خۆم بە باڵندەیەکی ئازاد دەبینم نەك وەك زۆرینەی خەڵك بە مێگەلبوونی خۆم رازی بم. هەر لە ریشەوە رقم لە کۆنسێپتی خەڵکە، لەبەرئەوەی بڕوام بە تاك هەیە. کاری راستەقینەم دژایەتی ئەو خووەی خەڵکە بە کۆمەڵ چەپڵە بۆ ستەمکارانیان لێ دەدەن، لە کاتێکدا من دەمەوێت پەیکەری ئەو دیسپۆتیزمە بڕوخێنم.

خۆم: پارادۆکسێك دەبینم، تۆ بۆ خەڵك دەنووسیت، بەڵام ئەوەی دەیبینم هیچ کات خەڵکت خۆشناوێت، تەنانەت چێژ لە نەیارێتی خەڵك وەردەگریت!.

من: لە ژیانمدا خەباتم کردووە دژی خەڵك و لە پێناوی پێگەیاندنی تاك دا. هەمیشە زۆرینە لەسەر رێگا هەڵەکەن!، هەمیشە خەڵك ناڕاستن و نامەوێت رەزامەندییان بەدەستبهێنم. کاتێك هەست بکەم زۆرینە لەگەڵم تەبان، شتێك دەکەم جیاواز و نامۆ بۆ ئەوەی یەکانگیر نەبم لەگەڵ سروشتی سۆزانیانەی خەڵك. هەمیشە حەزم لەوەیە ئەنتی بم لە بەرامبەر زۆرینەدا، لەو سۆنگەیەی ئەوەی رای گشتیی لەسەری تەبان، وێنایەکی ساختەی هەقیقەتە، تۆ وێناکە پێچەوانە بکەوە هەقیقەت لای تۆ دەبێت بە تەنیا. شتێکیش کە نابێت بیرم بچێت، ناو و ناونیشانی قەبە و زل لەسەر خۆم دانانێم و دڵداریی لەگەڵ سۆزی خەڵك ناکەم، بەڵکو تێزاب رۆ دەکەمە سەر برینەکانیان، ئەو منداڵە لاسارەی شانۆگەرییەکەی «ئەپسن»م کە بە پێچەوانەوەی هەموو خەڵکەوە سەرکێشی

وتنی ڕاستییەکەی کرد و هاواری کرد «پادشا ڕووتە».

خۆم: لەوە بگەڕێ ئێستا، دووبارە با بگەڕێینەوە سەر باسی خۆشەویستی، پێتوایە خۆشەویستی بەختەوەریی لە خۆ گرتبێت یان جۆرێك لە شێتی لە ئامێزیدا هەڵگرتووە؟.

من: بەختەوەریی لە هیچ شتێکدا بوونی نییە. بۆکۆڤسکی دەیووت «زۆربەی مرۆڤی سەر رووی جیهان شێت بوون». رەنگە گەڕان بە دوای هۆکارەکانی شێتیدا سەرئەنجام شێتمان بکات. بۆ نا، وەختێك سەیری ئەو دنیا لنگەوقووچە دەکەین شێت دەبین، ئەگەریش شێت نەبین بە گووتەی بوکۆڤسکی گەمژەین. ئەم جیهانە هۆکارێکت ناداتێ بۆ خۆشبەختی!, بەڵکو لە بناغەوە بەختەوەریی درۆیەکە لە چەشنی ئازادیی!. مرۆڤی ئەم چاخە مەحکومە بە گەمە «گلگامێش»ییەکە، ئەو تا مردن بە دوای وەهمی نەمریدا دەگەڕا، ئێمەش تاکوو شێتبوون بە دوای بەختەوەرییدا.

خۆم: کەواتە بۆچی خۆشەویستی دەکەین؟.

من: لەبەرئەوەی هیچ چارەیەکی ترمان نییە.

٢٠١٨-١١-٢٧

کاتژمێر: چواردە و پانزە خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-١٠-

من: مرۆڤ وازی لە خۆشەویستی هێناوە، چ خۆشەویستی بۆ سروشت، چ خۆشەویستی بۆ خۆی وەك مرۆڤ. هێندە دەستی وێرانکاریی بۆ هەموو لایەك درێژ کردووە نەك هەر

زەوی، بەڵکو خەریکە بۆشایی ئاسمان دەکەوێتە بن هەڕەشەی دەستدرێژیی و چاوچنۆکییەکەی. تێزێك هەیە دەڵێت جگە لە مرۆڤ هەرچی گیانەوەرانی ترن دۆستی سروشت و ژینگەن، مرۆڤ وەها زەوی شێواندووە، زانایان لەو باوەڕەدان دوو ملیۆن ساڵ دوای نەمانی مرۆڤ، ئینجا دەگەڕێتەوە بۆ کاتی پێش شۆڕشی پیشەسازیی. ئەمە هەمووی هۆکارێکی هەیە ئەویش نەمانی خۆشەویستییە.

خۆم: دوو ملیۆن ساڵ کاتێکی زۆر نییە سەبارەت بە گەردوون، بەڵام بە بەراوورد بە تەمەنی مرۆڤ ژمارەیەکی خەیاڵییە، سەیرە مرۆڤ هەموو پێشکەوتنەکانی خۆی لەسەر حیسابی تێکدانی رەوشی سروشت و ژیانی گیاندارانی دیکە پەرە پێداوە! نوخبەیەکی زۆر کەم نەبێت، حەوت ملیارد مرۆڤ بەشێوەیەکی دڕندانە رەفتار لەگەڵ ئەو رووبەرە ماندووەی ژیانکردن دەکەن کە ناوی زەوییە.

من: خودی گەردوون بەو پان و بەرینییە لە سەرەتادا قەبارەیەکی بچووکی هەبووە و دواتر بەشێوەی هەڵئاوسان زیادی کردووە، ئەوەی پێی دەوترێت تەقینەوەی گەورە «بیك بانگ» لە قەبارەیەکی بچووکدا روویداوە و پاشتر گەردوون بەم شێوەیە کشاوە کە نە سەری هەیە و نە بن. زەوی وەك بەشێکی زۆر بچووکی گەردوون، تاکە شوێنی کەشفکراوی ژیانی زیندەوەرانە، ئەمیش ئێستا لە ژێر هەڕەشەی لەناوچوونە. «ستیڤن هاوکینگ» پێش مردنی وتی «رۆژەکانمان لەسەر زەوی دیاریکراون»، بۆیە پێشنیاری کۆچی

مرۆڤی کرد بۆ سەر هەسارەیەکی تر بە مەبەستی بەردەوامیدان بە ژیان. پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ لەوێش ژیان هەمان ژیانی ئێرە دەبێت؟!. من ئێستا لە بری مەرگ، بیر لە چارەنووسی ژیان دەکەمەوە، دەمەوێت لە مێژووی ژیان و حیکمەتی بوون تێبگەم، ئەوە وەڵامی هەموو شتێکی لە هەگبەدا هەڵگرتووە، ئەگەر سەرکەوتوو بم دەتوانم بە دڵنیایی بژیم، رەنگە خوێندنەوەی کتێبەکەی هاوکینگ «کورتە مێژووی زەمەن» کتێبێك بێت لەم قۆناغەدا زیاد لە هەر کتێبێکی تری فەلسەفی بۆ من بایەخدارتر بێت.

خۆم: دیدە سپینۆزاییەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ژیر بیر لە ژیان دەکاتەوە نەك مردن. تەنانەت ترس لە مەرگ شتێکە زیاد لە خۆی گەورەتر کراوە. وەك خۆم لە مردن ناترسم، لە روانگەی ئەوەی ئەزموونم نەکردووە، کەسێکیش نەهاتۆتە باسی وەحشەتناکییەکەی بکات!. تەنیا ئەوەیە مردنم خۆش ناوێت، خۆشنەویستن جیایە لە ترسان. بە دیدی ئەپیکۆرس تۆقین لە مەرگ رێگەی شادبوونمان لێ دەگرێت، «هیگل» زۆر زیاتر لەمە دەڕوات و پێیوایە ترسان لە مردن فاکتۆرە بنەڕەتییەکەی چەوساندنەوە و کۆیلایەتییە.

من: ئەگەر بە دەستی خۆم بوایە هەرگیز رێم بە لە دایکبوونم نەدەدا، بەڵام کە بەبێ ویستی خۆم مەحکوم کراوم بە ژیان، پێ بە پێ لەگەڵیدا دەڕۆم. لە واقیعیشدا سەر زەوی خۆی گۆڕەپانێکی گەورەی ئۆپێرایە، هەر کەسەو جۆرە گۆرانییەکی تێدا دەچڕێت، یەکێك گۆرانییەکی

غەمگین، یەکێکی تر گۆرانییەکی شاد، بەڵام من تەنها سترانی خۆشەویستی تێدا دەڵێم تاکوو ئەو چرکەساتەی مردن دێت.

خۆم: ژیان و مەرگ دوو رووداوی ناوازەن و لەگەڵ یەکتر زۆر جیاواز نین، هیچ مەرگێك بە بێ هەبوونی ژیان لە ئارادا نییە، بە دیوێکی تردا مەرگ دەرئەنجامی ژیانە. جارێك «ئەدۆنیس» لە پۆستەرە شیعرێکدا نوسیبووی «ژیان پۆشاك دەکاتە بەری مەرگ، مەرگ رووتی دەکاتەوە». بەدەر لەمە هەستکردن بە پووچێتی ژیان یان رەشبینی لە بەرامبەر هەبووندا، مانای ئەوە نییە دەست لە ژیان بشۆین و بەدیار هاتنی مەرگەوە ئێشك بگرین یان خۆمان بڕیار بدەین لەسەر مەرگمان. ئاخر هەر خودی ژیان کەشتییەکە بە خۆی و سەرنشینەکانییەوە نقومی زەریای مەرگ دەبێت.

من: مرۆڤێکی رەشبینم، تاکو ئەندازەیەکی زۆریش ژیان بە شتێکی پووچ دەزانم، لەگەڵ ئەوەشدا دژی خۆ لەبەین بردنم، ئاخر خۆکوشتن هەڵهاتنە لە باری قورسی ژیان، هەرگیز پشتیوانی لە هیچ هەڵهاتنێك ناکەم، زۆرجار ئەو بیرۆکە و خورەیە هاتووە بە مێشکمدا، بەڵام بە خۆشەویستی ژنێك لە خۆمم دوور خستۆتەوە. لە روانگەی «ئەلبێر کامۆ»دا هۆکارەکانی بەردەوامیدان بە ژیان چەند هێندەی فاکتۆرەکانی خودکوژیی ماقووڵ و رەواترن، هەرچەند ژیان زەحمەتە و تاکو لوتکەش بێمانایە، بەڵام لە ژیان بێماناتر خۆکوشتنە، بگرە خۆکوژیی لوتکەی بێمانابییە.

خۆم: داتا و ئامارەکان پێماندەڵێن رێژەی خۆکوشتن

لەسەرتاپای جیهاندا لە ساڵێکدا لە ٨٠٠ هەزار حاڵەت تێپەڕبوە، دەکرێت ئەم دیاردەیە فراوانتر قسەی لەسەر بکرێت و لەو چوارچێوە تەسکەی جیهانبینی «دۆرکهایم» بهێنرێتە دەرەوە کە باز بەسەر باری دەروونی تاکی خۆکوژدا دەدات، کە هەر ئەوەندەی لە دەستدێت بە «دارمانی ئەخلاقی» پێناسەی بکات. پێموایە خۆکوشتن هەمیشە هەڵهاتن نییە لە ژیان، بەڵکو هەڵهاتنە لەو کێشە دەروونی و کۆمەڵایەتیانەی ژیان بۆ مرۆڤی دروست دەکات. تەنانەت زۆرجار فەلسەفەش پشتیوانی ئەو کردەیەی کردووە.

من: قوتابخانەی فەلسەفەی ڕەشبینی هەمیشە پشتیوانی خۆکوژی ناکەن، وجودییەکان ژیان وەك ئازارێك دەبینن بەڵام هانی مرۆڤ دەدەن بۆ چێژوەرگرتن لەو ماوە کورتەی لەژیاندا بەدەستییەوەتی. هەر خۆم لە سەرەتای خوێندنەوەی فەلسەفەی ئەڵمانیدا، تووشی کەسێکی وەك «شۆپنهاوەر» بووم، ئەو فەیلەسووفێکی سەرسامکەرە، زۆر بە خێرایی سەرنجی ڕاکێشام و کەوتمە ژێر کاریگەریی تێزەکانییەوە، هەموو ئەو فۆرمۆڵەبەندییانەم قبوڵ کرد کە باس لە بێهودەیی ژیان و پووچی بوون دەکەن، بەڵام هیچ کات نەمتوانی ئەو بەشە لە تێفکرینی گەوار بکەم کە هانی کردەی خۆکوشتن دەدات. زۆر جار وا باشە مرۆڤ دەستکاریی یاسا سروشتییەکان نەکات، چ پێویست بەوە دەکات ئەو مەرگە حەتمییەی چاوەڕوانمانە لە ڕووی کاتەوە پێشبخەین؟.

خۆم: شۆپنهاوەر لەگەڵ ئەوەی ڕەشبین بوو، بەڵام

کاریگەریی بەرچاوی هەبووە لەسەر ئەدگاری فەلسەفە لە دوای خۆی، ئەو ئاتەئیست و راسیۆنال بوو، وتەزا بە ناوبانگەکەی «کێشە فەیلەسووفەکان لەوەدایە، بۆ دۆزینەوەی راستییەکانی بەردەمیان، سەیری ئاسمان و ناو هەورەکان دەکەن». ئەمەش داگرتنی ئیشی فەلسەفەیە لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی. جیاواز لەمە هەستدەکەم هەمیشە رەشبینی کردار نییە، بەڵکو پەرچەکردارە، دیاردەیەکە هەمیشە لەناو ناهەمواریی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونیدا لەدایك دەبێت. بەڵام ئاخۆ نەوەی ئێمە ئەو رەشبینییەیان لە چییەوە بۆ ماوەتەوە؟. بۆچی ئێمە نەوەیەك بووین نەماندەتوانی پێبکەنین، تەنیا فێری فرمێسك رشتن و گریان ببووین؟.

من: ئێمە نەوەیەك بووین بەر نەفرەتی مێژوو کەوتین، چوونکە ژیانمان کەوتە بەرداشی شەڕی براکانی کورد لە شاخ و شار. حکایەتەکانمان پڕن لە گریان و کابووس، زمانمان بە خەم پڕا، لەناو رەورەوەی نائومێدییدا پێمان گرت، داری تەمەنی گەنجیمان بەری غوربەت و سەر هەڵگرتن لە نیشتمانی گرت، جوانترین وشەکانمان بوونە پەتی سێدارەی گەردنی ئارەزووەکانمان، بێگەردترین خەونەکانمان دەیان جار مۆتەکەی قاتوقڕی لاقەی کردن، هەگبەی ژیانمان لێوانلێوە لە زامی قووڵ قووڵ و خاڵی خاڵییە لە رەنگە پەلکەزێڕینەییەکانی ژیان، ئێمە بە مردوویی لە دایکبووین و

لە باوەشی نیشتمانی دایکدا چەند جار کوژراین، لە رەگەوە هەڵکێشراین، تازە لەم بەردەڵانەی مەنفا چرۆ دەرناکەینەوە، ئێمە لە بەهاری رۆژهەڵاتدا وەرین، لەم خەزانە هەمیشەییەی خۆرئاوادا سەوز نابینەوە، ئێمە نەوەیەك بووین لە ژێر دووکەڵی باروت و لە سایەی ئەژدەهاکاندا چاوەکانمان پڕ کران لە رەنگی تاریکی رەشبینی، گوێیەکانمان تەژی کران لە قریشکە و هاوار، ئێمە نەوەیەك بووین قرمان تێکەوت و ژیان بەهەموو شێوەیەك پشتی تێکردین. ئیدی بیانوومان هەبوو بۆ رەشبینی کە من بۆ ئەم نەوەیە کەمترین بیانوو دەبینمەوە تاکو ژیان بە لێڵی ببینن.

خۆم: نەوەی ئێمە هەرچەند رەشبین بوو، نەوەیەکیش بوو هەموو پەنجەرەکانی ئازادیی بەڕوویدا داخرابوون، کەچی هەمیشە چاومان لە ژیان بڕیبوو، تەنانەت لە ژێر دیسپۆتیزمی ئاین و ترادیسیۆندا، رەنگی خۆشەویستیمان تۆخ دەکردەوە، ئەوەی سەیرە ئەم نەوەیە بە رەشبینییەکی دەستکردەوە، پۆرترێتی خۆشەویستی دەشێوێنێت.

من: خۆشەویستی هەروەك خۆی دەمێنێتەوە، هیچ کات ناشێوێت، خۆشەویستی تاکە شتە کە قابیلی شێواندن نییە، رەنگە لەبەر چاوان ون ببێت، بەڵام هەمیشە کۆمەڵێك فیگەر هەن لە رۆحیاندا دەیپارێزن. ئەوەی لە کۆتاییدا لەم جیهانەدا دەمێنێتەوە تەنیا خۆشەویستییە، بۆیە ئازیزم هاوشێوەی نامەکەی «شاملۆ» بۆ «ئایدا» پێنج جار پێتدەڵێم

«زەردەخەنە لە بیر مەکە». خۆشەویستی هەرچەند تاڵیش بێت، بەڵام جگە لە زەردەخەنە هیچ شوێنەوارێکی تر بەسەر رووخسارمانەوە جێناهێڵێت.

٢٠١٨-١٢-١

کاتژمێر: هەژدە و سی خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-١١-

خۆم: پێشتر وا تێدەگەیشتم تەنها مرۆڤە ناسکەکان دەتوانن خۆشەویستی بکەن!، پێش ئەوەی درەنگ بێت بیرم کردەوە دەشێ درندەکانیش بە کردەی خۆشەویستی هەڵستن، کاتێك مێژووی ژیانی دیکتاتۆرەکانم خوێندەوە، جیاواز لە کرۆنۆلۆژیای خوێن و کابووس و کوشتن و دڵڕەقی، ئەوەی جێی راوەستان بوو بۆم خۆشەویستییە. تەنانەت زۆرێك لە دیکتاتۆرەکان لە بەرامبەر خۆشەویستیدا هەستیان بە لاوازی کردووە. زۆرجار ژنێك دڵی دیکتاتۆرترین پیاوی هێناوەتە لەرزین. لەم سۆنگەوە دەڵێم خۆشەویستی جادوویەکە دڵڕەقترین مرۆڤەکانیش ناتوانن خۆیانی لێ بپارێزن.

من: خۆشەویستی هێزێکە توانای زاڵبوونی هەیە بەسەر هەر دۆخێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی ئینسان‌دا، بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆشەویستی لە مردن دەچێت، شا و گەدا ناناسێت، پلەی کۆمەڵایەتی و چینایەتی ناناسێت، رەچاوی دۆخی سایکۆلۆژیی کەسیش ناکات، من دەتوانم

لەوپەڕی نهلیزمدا خۆشەویستی بکەم، دەتوانم لە رەوشێکی هیپیستیدا بکەومە داوی خۆشەویستییەوە، یان تۆ دەتوانیت لە سەرەتای تەمەنەوە خۆشەویستی بکەیت، یان لە کۆتایی تەمەندا بۆی بگەڕێیتەوە، هەر چۆنێك بیگریت مرۆڤ مەحکومە بە خۆشەویستی، دیکتاتۆرەکانیش دواجار هەندێك هەست و خەسڵەتی مرۆییانەیان تێدا دەمێنێتەوە تاکو بتوانن کەسێکیان خۆش بوێت.

خۆم: زۆرێك لە دیکتاتۆرەکان لە ئەنجامی تێکشکان لە پەیوەندییەکی سۆزدارییدا، دووچاری گرێی دەروونی بوون، هیچ دیکتاتۆرێك نییە لە دنیادا ژنێك دڵی نەشکاندبێت یان ئەزموونێکی خراپی لەگەڵ خۆشەویستی نەبووبێت. دەکرێت ئێمە هاوکێشەکە پێچەوانە بکەینەوە و بڵێین ئەگەر تێکشکانی عاتیفی نەبوایە ژمارەی دیکتاتۆر و ستەمکاران بەو ئەندازەیەی ئێستا نەدەبوو. مۆسۆلینی، هیتلەر دوو نموونەی سوپەر دیکتاتۆرن، ئەگەر رۆبچینە نێو وردەکاریی بایۆگرافیایانەوە ئەزموونی تێکشکانیان لە رووی سۆزدارییەوە دەبینین. لەو باوەڕەدام تا خۆشەویستی لە ژیانماندا هەبێت، هەلومەرجی بابەتی بۆ دڵڕەقی و خەونی ستەمکاریی کەمتر دەبێتەوە.

من: ئەمەی تۆ دەیڵێت هەر ئەو ئەنجامەیە «فرۆید» تیۆریزەی کردووە، کاتێك دەڵێت «خۆشەویستی وەکوو رەمەکی ژیان، هەر لە سەرەتای ژیانەوە کاری خۆی کردووە، پاشان لە بەرامبەر ئەم غەریزەیەدا رەمەکی مردن دەرکەوتووە، لێرەشەوە مەتەڵەکانی ژیانمان بۆ روون دەبێتەوە». مادام

خۆشەویستی غەریزەی ژیانە، کەواتە دیکتاتۆرەکان دەکەونە دەرەوەی ژیان، ئەگەر لە دروشمی فاشیستەکانی ئیتالیا ورد بینەوە «بژی مەرگ»، ئەو فاکتەمان زۆرتر لەلا روون دەبێتەوە، بۆ ئەوەی دیکتاتۆر بەرهەم بهێنیت، دەبێت سەرەتا مەرگپەروەر بیت نەك ژیاندۆست، ژیاندۆستییش بە دیدە فرۆیدییەکە واتە خۆشەویستی.

خـۆم: کەواتە ئێمە چۆن دەتوانین نیشانەکانی خۆشەویستی لە ژیانی دیکتاتۆرەکاندا بناسینەوە؟. راستە سیستمی دیکتاتۆریی لەسەر دڵڕەقی و رەتکردنەوەی ژیان و خۆشەویستی راگیراوە، بەڵام ئایا ئەمە لەسەر ئاستی تاکەکەسیش هەروایە؟. ئایا مافمان هەیە بانگەوازی ئەوە بکەین دیکتاتۆرەکان وەك تاکەکەسیش لە مانای خۆشەویستی تێناگەن؟.

من: ناکرێت دیکتاتۆرەکان تەجرید بکەین لە توخمی مرۆڤ، تەنیا ئەوەیە دیکتاتۆرەکان خۆیان بە نموونەی سوپەر و بوونەوەری خەیاڵئامێز و فریادڕەس نیشان دەدەن، ئەمە دیوی فەرمی و ئاشکرای ژیانی هەر دیکتاتۆرێکە، دەشێ ئێمە دیوی ناوەوە و ئاسایی ژیانی ئەوانیش ببینین، کە وەك هەر مرۆڤێکی تر شاد دەبن، پێدەکەن و دەگرین، تووشی تراوما دەبن، لەحزەی ناجیددیان هەیە، سۆزیان دەجوڵێت. هەر بۆ وێنە کۆچی یەکەمین هاوسەری ستالین، «ئاکاترینا سڤاندێزی» لە ساڵی ۱۹۰۷، نموونەیەکی باشە بۆ روونکردنەوەی ئەم پرسە، کاتێك لە مەراسیمی بەخاکسپاردنیدا، ستالین دەڵێت

«تەنها ئەم بوونەوەرە نازدارە دەیتوانی دڵە رەقەکەم ئارام بکاتەوە، ئەویش مرد، بە مردنی ئەو هەموو هەست و نەستم بەرامبەر بە مرۆڤ نامێنێت». پاشان دەستی راستی لەسەر دڵی دادەنێت و دەڵێت «ناتوانم چیتر هەستم دەربڕم». ئەمە هەمان ئەو ستالینەیە بیست ملیۆن مرۆڤی کوشت و توانی سەربکەوێت بەسەر نازیزمیشدا.

خۆم: کەواتە خۆشەویستی و مردن دوو رووداوی هاوبەشن لە ژیانی هەر مرۆڤێکدا. خۆشەویستی هەروەك مردن هیچ کات نافەوتێت. جارێك «پاولۆ کۆیلۆ» وتی «خۆشەویستی تاکو سەر دەمێنێتەوە، ئەوەی دەگۆڕێت خودی مرۆڤەکانن» بە تێگەیشتن لە خۆشەویستی و کاریگەریی ژن لە ژیانی دیکتاتۆرەکاندا گەیشتمە ئەو بڕوایەی خۆشەویستی لە مردن بەهێزترە، چوونکە وامان لێدەکات ژیانمان پووچ نەبێت، یان هۆکارێکمان دەداتێ بۆ بەردەوامبوون لەسەر ژیان.

من: وەك خۆم لە ژێر کاریگەریی ژینگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیی ئەوسادا، لە سەرەتای لاویدا دەمووت بۆ ئەوەی بەردەوام بین لە ژیان پێویستە جیهانێکی باشتر دروست بکەین بە میکانیزمی شۆڕشگێڕانە، ئەو قۆناغە شۆڕشگێڕێکی رادیکاڵ بووم، دوای پووکانەوەی ئەو خەونە گەورەیەم، بەرەو رێگە «نیتچە»ییەکە خزام کە «ئەگەر نەتتوانی ژیانێکی شایستە بژیت ئەوە مەرگ هەڵبژێرە». زوو لەمەش ژیوان بوومەوە، هەنووکە دەڵێم کوالێتی ژیانت هەر چۆنێکە تەنها خۆشەویستی هەڵبژێرە، ئەوەی واتایەك بە

ژیانمان دەبەخشێت خۆشەویستییە هەر ئەویش لەمەرگ دەمانپارێزێت.

خۆم: ئامۆنز، لە شیعرێکیدا دەڵێت «پەیوەندیم بەدنیاوە خۆش نەبوو.. سەرەتا شتێکم نەبوو لەوەی دنیا دەیەوێت.. دواتر دنیا ئەو شتەی نەبوو کە من دەمەوێت». ئەو کاتانەی خۆشەویستی هەبوو من سەرقاڵی کارێکی تر بووم، با بڵێم ئەو کاتەی خۆشەویستی لە بەردەم دەرگامدا بوو، من لە پەنجەرەوە بۆ نیگارێکی ترم دەڕوانی، ئەمێستاش دنیاکەی من ئەو خۆشەویستییەی تێدا نەماوە من دەیخوازم. خۆشەویستی هاتۆتە خوار حەزیشەوە، بووە بە درۆ و پاساوێك بۆ بەڕێکردنی چەند شەوێکی سوور.

من: تۆ دەبێت تێبگەیت ژیان رەوشێکی دیالێکتیکییە، لە جێگەیەك ناوەستێت، خۆشەویستی هەروەك جوانی وایە، بە پێی سەردەمەکان پێناسەکانی دەگۆڕێت، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بە جێگیری دەمێنێتەوە.

خۆم: خۆشەویستی شتێکە قابیلی دەستکاریکردن نییە، یەك سیمای هەیە بە درێژایی مێژوو، ئەوەی دەگۆڕێت تێڕوانینی ئێمەیە بۆ ئەو چەمکە. ئێستاش خۆشەویستی بچووك کراوەتەوە بۆ بەریككەوتنی دوو جەستە. ئەمە دیاردەیەکی نامۆی هاوچەرخە.

من: هەمیشە دەمگەڕێنیتەوە چوارگۆشەی یەکەم و باسی بابەتی رۆح و جەستە. فیساگۆرسییەکان پێیانوایە رۆح لە جەستەدا بەندە، تەنها لە کاتی مردنی جەستەدا ئازاد

دەبێت!!, ئەوان جیا لەوەی بڕوایان بە دۆنادۆنی رۆحە، لە هەمان کاتدا جەستە بە شتێکی پووچ دەبینن، لەبەرامبەردا «میرۆلۆپۆنتی» پێداگریی دەکات بوونی مرۆڤ بەستراوەتە بە بوونی جەستەوە، لە دەرەوەی جەستە ئینسان لە ئارادا نییە. ئەگەر گریمان رۆح هەیە، خۆشەویستی تەنها دیاردەیەکی رۆحی نییە، بەڵکو جەستەیشە، بەریەککەوتنی جەستەکان بە تەنیا لە خۆشەویستیدا مانای هەیە، تۆ خۆشەویستی لەگەڵ من بکەیت، ناتوانیت جەستەی خۆتم لێ دوور بخەیتەوە، ئەگەر واتکرد هێشتا لەنگییەك هەیە و پەیوەندییەکە ماوێتی ببێتە خۆشەویستی.

خۆم: هەمیشە ئەوەی لە پێکگەیشتنی جەستە دەسڵەمێتەوە ژنە، چوونکە دڵنیا نییە ئەو پیاوەی لە ژێر ناوی خۆشەویستی پەیوەندیی لەگەڵ دەگرێت، تەنیا خوازیاری پەیوەندیی جەستەییە و نایەوێت ببێتە بەشێك لە دنیای ئەو ژنە.

من: ئەوە راستە پیاوی ئێمە تەنها بە چاوی لەش ژن دەبینێت، هەمیشە سەرنجی دەچێتە سەر جەستەی ژن و وەك نێچیرێکی سێکسیی سەیری دەکات، ناتوانێت خۆشی بوێت بەڵکو حەزی لێ دەکات!، حەز شتێکە زۆر لە خوار خۆشەویستییەوە، بە حاستەم پیاوێك هەیە لە جیهانی ژن تێبگات، لە خەسڵەتەکانی ژن حاڵی ببێت، تاکو پیاو لە ژن تێنەگات ناتوانێت خۆشی بوێت، هەر کات توانی لێی تێبگات پاشان خۆشی بوێت، ئەوسا پەیوەندیی جەستەیی بە

ئۆتۆماتیکی روودەدات!، بۆیە هەمیشە ویستوومە لە پێشدا لە ژن تێبگەم ئینجا خۆشم بوێت.

خۆم: کێشەکە ئەوەیە فەلسەفەی چێژگەرایی بووە بە بەشێك لە تێڕوانینی پاترپارکی، هەمیشە پیاو وەك سەرچاوەی لەزەت لە ژن و ژیان دەڕوانێت. ئەمە هەر ئەوەیە «لینین» رکی لێ دەبووە و بە ئاکاری بۆرژوازیانەی لە قەڵەم دەدا.

من: سەرەتا خودی لینین وەك دیکتاتۆرێك تێڕوانینەکەی لە ژێر پرسیار و گوماندایە، لە باری کرداریشەوە ئەزموونی پێچەوانەی قسەکانی خۆی پیادە کردووە. سەبارەت بە چێژگەرایی ئەوە بناوانێکی فەلسەفی دێرینی هەیە، فەلسەفەی «ئەبیکۆریزم»ی چاخی هێلیسنتی وەها سەیری ژیان دەکات، تەقەلا و کۆششی مرۆڤە بۆ مسۆگەرکردنی ئەندازەیەکی زۆری چێژ. چێژگەرایی هەر رەهەندی سێکسوالێتی ناگرێتەوە، ئەگەرچی سێکسیش یەکێکە لە سەرچاوەکانی چێژ و ژیاندۆستی، بەڵام هەموو چێژەکانی ژیان لە خۆ ناگرێت، سەلمێنراوە ئەوانەی قێز لە سێکس دەکەنەوە جیا لەوەی لە رووی دەروونییەوە ساغڵەم نین و کەسایەتییەکی سیکۆپاتیان هەیە، لە هەمان کاتدا تا رادەیەکی بەرز مەترسیدارن، چون ئەوان هەمیشە تابووری نوستووی هەموو هێزە مەرگدۆست و دەسەڵاتە تۆتالیتارییەکانن.

خۆم: لە دوای شۆڕشی پیشەسازیی و باڵابوونی سیستەمی کاپیتالیزم، جەستەی ژن بووە بە کاڵا و ماتریاڵێکی هەرزانی بزنس. سەیری ئەو هەموو مافیا جۆراوجۆرانە بکە چۆن

سەرمایەگوزاریی بە جەستەی مێینەوە دەکەن.

من: قسەی ئێمە لەسەر تێگەیشتنە لە جەستە، پێشتر جەستە بابەتی توێژینەوەی پزیشکی بوو، بەڵام ئێستا ماتریاڵی توێژینەوەی دەروونی و فەلسەفیشە، راستە ئێمە خۆمان لە رووی بایۆلۆجییەوە خاوەندارێتی لە جەستەی خۆمان دەکەین، بەڵام بە مانای ئەوەش نییە جەستەمان لە رووی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە لە بن دەستی خۆماندا مابێتەوە، بەو پێیەی جەستە هەمیشە پەروەردە و سیستم کڵێشەی جەستەمان بەو جۆرە رەنگ دەکەن خۆیان دەیانەوێت.

خۆم: ژنانی ئێمە لە جەستەی خۆیان دەترسن، بۆیە هەمیشە خۆشەویستی وەك پێدراوێکی رۆحی وەردەگرن، رەنگە ئەو ترسە زۆر لە جێی خوێدا نەبێت، بەڵام لەو دەرئەنجامانە دەسڵەمێنەوە کە لە کاتی ئازادکردنی جەستەدا دێنە ئارا.

من: ژنی ئێمە لە بواری بایەخدان بە جەستە و ماکیاژ و نەشتەرگەریی جوانکاریی، تووشی درمی مەسرەفگەرایی بووە، بەڵام نازانێت فەلسەفەی ئەو بایەخدانە بە لەشولاری لە کوێدایە. کاتێك گوێی بۆ دەگریت، باسی بۆشایی رۆحی خۆی دەکات، ئەو رۆحەی من زۆر بە گومانم لێی، تێناگات بەڵاکە بۆشایی رۆحی نییە، بەڵکو ئەوەیە فێر نەبووە چۆن جەستەی ئازاد بکات، یان ئازادانە مامەڵە بە جەستەی خۆیەوە بکات، ناچار بە دوای بەهانایەکی تردا دەگەڕێت لە دەرەوەی جەستەی.

خۆم: کەواتە چارەسەری هەموو شتێك خۆشەویستییە.

تەنانەت هەموو ترسێك بە خۆشەویستی لەناودەچێت. ئەمە هەمان ئەو گەوهەرەیە هەمیشە «ئۆشۆ» پێداگریی لەسەر دەکات.

٢٠١٨-١٢-٥

کاتژمێر: سیانزە و پێنج خولەکی نیوەڕۆ

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-١٢-

مـن: جـارێـك پـرسـیـاریـان لـێکـردم لـە بـارەی مێژووی خۆشەویستی، بەلامەوە پرسیارێکی گەورە و تا رادەیەکیش بێ مانا بوو، نامەوێت خۆشەویستی بخەمە ناو مێژووەوە بەڵکو لە دەرەوەی مێژوو دەیهێڵمەوە، ئەو شتەی بکەوێتە ناو بازنەی کاتەوە، کۆتایی هەیە وەك چۆن سەرەتای هەیە. پێناسە میتافیزیکییەکان بۆ خودا ئەوەیە زاتێکە لە دەرەوەی شوێن و کات، هەر توخمێك لە دەرەوەی کات بێت بە واتای ئەوەشە خودێکی نەمرە، هەر بۆیە هەوڵمداوە خودا بە خۆشەویستی یان خۆشەویستی بە خودا پێناسە بکەم، ئەمە روانگەی «ئۆشۆ»شە، بەڵام ئەوەی من دەمەوێت سروشتێکی خودایی ببەخشمە خۆشەویستی، بۆ ئەوەیە بیسەلمێنم خۆشەویستی نەمرە و قابیلی ئەوە نییە بخرێتە ناو چێوەی کاتەوە.

خۆم: مرۆڤی عاشق بەدەستی خۆی مێژوو دەنووسێتەوە، نەك مێژوو بینوسێتەوە، لە «گیرفانی پاڵتۆی» هیچ کەسەوە نەهاتۆتە دەرەوە، بەڵکو کەسانی تر لە کۆشکی ئەمەوە سەر دەردەهێنن، مرۆڤی عاشق کوێرە و سەرسام نییە بە هیچ

کەسێك جگە لە مەعشوق، کە دەیەوێت لە پرۆسەیەکدا لەگەڵیدا بچێتە دۆخی یەکبوونەوە. دەکرێت بڵێین عاشقەکان ئەوانەن تا چڵەپۆپە ئازادییان بەدەستهێناوە، هەڵەش نییە ئەگەر بشڵێین رۆحێکی کۆیلە و کۆنترۆڵکراویان هەیە! چون هەموو هەوڵێکیان بۆ راگرتنی دڵی مەعشووقەکانە. مرۆڤ لە کردەی خۆشەویستیدا لە یەك کاتدا هەم جوانی دادەهێنێت هەم جوانیش دەیترسێنێت، ئاخر عاشقبوون رەوشێکی دەروونی ترسناکە، بەو پێیەی لەو پرۆسەیەدا مرۆڤبوونی خۆی بەرەو بوونەوەرێکی سەرتر جێدەهێڵێت، بەرەو شتێکی بەرزتر لە ئینسان هەنگاو هەڵدەگرێت، دەبێتە خودا!. بەدیتنی خۆم سوپەر مرۆڤەکەی نیتچە «ئەوەی گەیشتۆتە دوای پلەی ئازادیی و رەهابوون» بەجۆرێك لە جۆرەکان عاشقەکانن، ئەمە بێ نکۆڵیکردن لەو دیمەنەی هەردەم عاشقەکان بەرامبەر واقیع، پاسیڤ و دەستەمۆن، بەڵام ئازادیی یان با بڵێین بەختەوەرییەکی دەروونیان بەدەستهێناوە.

من: ئەوەی بۆ من لە هەر بابەتێکی زیاتر جێی بایەخە، خۆشەویستییە بە مانا ئەبستراکتەکەی. هەمیشە تێکۆشاوم لە پێناو دۆزینەوەی نوێترین میتافۆر بۆ باسکردن لەم چەمکە، ویستوومە بە دیالێکتیکێك قسە بکەم هەرگیز بەو فۆرمە گوزارشت لە ناوەڕۆکی خۆشەویستی نەکرابێت، زمانی من بۆ پەسندانی خۆشەویستی جیاوازە لەو رستە کلاسیکی و سواوانەی هەمیشە ساکارانە لە ستایشی خۆشەویستیدا دەردەبڕدرێن، خۆشەویستی وەك سزا یان بەختەوەریی

نابینم، خۆشەویستی وەك فاكتۆر بۆ نەمریی و گوزارشتكردن لە مرۆڤبوون چاو لێدەكەم، لە هەموو شتێكدا و لە هەموو شوێنێكدا، لە سەرەتا و كۆتاییدا خۆشەویستی دەبینم، وەك وتم خۆشەویستی ئەبستراكت ستراتیجی ژیانمە.

خۆم: كەواتە تۆ دەتەوێت بڵێیت، خۆشەویستی كردەیەكە لە چەشنی مۆمیاكردن، هەڵماندەگرێت و دەمانپارێزێت بۆ مێژوویەكی ئێجگار دوور و درێژ. لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستی هەمیشە رەهەندێكی رۆحیی و هەستەكی قووڵی هەیە، كەچی ئەوەی جێگەی تێبینییە تۆ هەوڵت بۆ ئەوەیە خۆشەویستی رەهەندی جەستەیش بگرێتەوە. زۆربەی جار غەریزە بكوژی خۆشەویستییە، نەك زۆر جار بەڵكو هەموو كات.

من: قسەكانی خۆمم بیرە، پوكانەوەی مێشكم رووداوێكی بایۆلۆجییە، بەڵام گەشەكردنی بیر و گۆڕانكاریی ئەندێشە و پەرەسەندنەكانی ناو مێشكم دیاردەیەكی فیكریی. هیچ كات خۆشەویستی لەسەر رەتكردنەوەی لەمس و ئاوێتەبوونی جەستەكان رانەوەستاوە، ئەمە دیدێكە بارگاوییە بە سۆفیزمێكی كوێرانە و بەرتەسك، خۆشەویستی لە رێی جەستەوە مانا پەیدا دەكات، وەك چۆن نیشانەكانی لەسەر رووخسار و بە جەستەوە دەردەكەون، هەروەك شیعرەكەی «ژاك پریڤێر» ئاماژەی بۆ دەكات «تەنانەت ئەگەر تۆش بە چاوێكی جوانەوە نەیبینی.. دیمەنەكە ناشرین نییە.. ئەمە چاوی تۆیە لەوانەیە خراپ ببینێت».

خۆم: پێداگریی لەسەر خستنە ناوەوەی پەیوەندیی

جەستەیی بۆ ناو بازنە رۆحییەکەی خۆشەویستی، هەمیشە ویستێکی نێرانەی لە پشتە ئەگەر نەڵێم ویستێکی غەریزیی پیاوانە. زۆرجار نێرینە دوای مەست و حەیرانبوونی لە پەیوەندیی جەستەیی دنیای خۆشەویستی ژن جێدەهێڵێت، لە راستیدا جیهانێکی شێواو و رووخاو وەك شوێنەواری جەنگێکی نارەوا جێدەمێنێت، ئەمە تراوما راستەقینەکەی ژنە لە تێکەڵاوکردنی جەستە لەگەڵ خۆشەویستی.

من: ئێمە ناتوانین دوو دەستەواژە بە جیا بەکاربهێنین «جەستە و خۆشەویستی» لە سۆنگەی ئەوەی خۆشەویستی پەیوەندیی جەستەیش لە خۆ دەگرێت. ئەو کێشەی تۆ باسی دەکەیت، تەنیا دیوە فۆرمالیستییەکەی بابەتەکەیە، چون بەم پێوەرە سێکس دەبێتە دیاردەیەکی بایۆلۆژیی ناچاریی نەك سەرچاوەی شادیی، ئەم دیدە دەکرێت فاشیزمیشی لەسەر بینا بکرێت، فاشیزم لە دوا رەهەندیدا بریتییە لە مەرگپەرەوەریی و قێز لە ئیرۆسییەت. جیا لەمە لە خەیاڵدانی پاتریارکی یان ئەو دیدە خێڵەکییەی بیرکردنەوەی ئێمە ئاراستە دەکات، هەموو کات لە سێکسدا نێرینە وەك سوبێکت وێنا دەکات، لە بەرامبەردا وەك ئۆبێکت لەویتری مێینە دەڕوانێت، ئەم تێڕوانینە ژەهراوییە وای لە ژنی ئێمە کردووە نەك لە سێکس بترسێت، بەڵکو لە هەر پێکگەیشتنێکی غەریزیدا هەست بە دۆڕان و گوناهباریی بکات. خۆشەویستی ئەم هاوکێشە لاسەنگە هاوسەنگ دەکاتەوە، کە دواجار سێکس کردەیەکی هاوبەشی نێوان هەردوو رەگەزە و هەردوولا وەك یەك

سوبێکتن. «ئێمە لێرەدا گریمانە لەسەر پەیوەندیی سێکسی نێوان هەردوو ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەکەین».

خۆم: مادام وایە با زیاتر خاڵ بخەینە سەر پیتەکان. پیاو «نێر»ی ئێمە هەمیشە بۆ پەیوەندیی جەستەیی بیانووی خۆشەویستی پێیە، تەنانەت شیعری عاشقانەی نوخبەکەش بۆ دروستکردنی ژنێکە بە دڵی پیاو، ئەمەش بە ناوی ئازادییەوە بەسەر بیرکردنەوەی ژناندا دەسەپێنرێت، بە واتایەکی تر تێڕوانینی نوخبەش بۆ بەرهەمهێنانی ژنێکە تەنها جەستەی ئازاد بێت و شێوەی جلەکانی وەك کچانی فۆتۆ مۆدێل بێت، ئەمەش تەنیا ئارایشتێکی عەقڵی پیاوسالارییە.

من: دەستت خستە سەر برینە مەترسیدارەکە. دیدی زاڵ ئەوەیە ئازادیی مێینە لە بە کاڵاکردندا دەبینێتەوە، ئەمە تەنیا بەرهەمی عەقڵی کۆنسەرڤاتیزمی ڕۆژهەڵاتی نییە، ئەمە نۆرمێکە سیستمی کاپیتالیزم برەوی پێدەدات، کۆمپانیا و فابریکەکان لە پشتی ئەم دیاردەیەوەن، جەستەی ژن وەك ماتریاڵێك بۆ بزنس و ڕیکلام بەکاردەهێنن. ئەوەش ڕاستە هۆشی دەستەبژێری ڕووناکبیریی ئێمە «کورد» لە ناو هەمان گووتاری نێرسالاریی سەرمایەدارییدا دەخولێتەوە، تەنانەت شیعر کە زمانی هەستێکی ڕووتە بۆتە بەشێك لەو پرۆسەی بە کاڵاکردنە. ئەمە قسەیەکی «ئەدۆنیس»م لە بارەی «نزار قەبانی» وەبیر دەهێنێتەوە وەختێك وتی «لەو بڕوایەدام قەبانی شاعیرێکی گەورەیە، بەڵام سەیرکردنی بۆ ئافرەت بە پەسەند دانانێم، چوونکە ڕواڵەتیانە یارمەتی ئافرەت دەدات

بۆ ئەوەی لە کۆت و بەندەکان خۆی رزگار بکات، وای لێکردووە بە پێی ئارەزووەکانی ئەو بایەخ بە جەستەی خۆی بدات، بەڵام خۆی لە قەرەی رەگوریشە قووڵەکانی مەسەلەی ئازادبوون نەداوە».

خۆم: دیدی پیاوسالاریی سادیزمە و بەرخوردەکانیشی بۆ ژن دۆزەخە، مارکیز دی ساد «ئەوەی نەخۆشی سادیزم بە ناوی ئەووە ناونراوە» لە نامەیەکدا بۆ هاوسەرەکەی دەنووسێت «ئۆرگازمی راستەقینە لە مەرگدایە». دروست ئەمە دیدی پیاوسالارییە بۆ ژن، هەموو ئۆرگازمی پیاوانەی خۆی لە مەرگی رۆح و دەروونی مێینەدا دەبینێتەوە. من هەمان بۆچوونی «کالیکس»م هەیە کە ئالان بادیۆ بیرمان دەخاتەوە و بەپێی روانگەی ئەو مرۆڤی شاد «happy man» کەسێکی ستەمکارە و بە میکانیزمی توندوتیژیی زاڵ دەبێت بەسەر ئەویتردا. لە راستیدا پیاوی شاد «لە زمانە ئەوروپییەکاندا دەستەواژەی پیاو بۆ مرۆڤ بە کاردێت» ئەوەیە بە هۆکاری توندوتیژیی مێینە رام و کەوی بکات. بۆیە ئەم مرۆڤە شادە نەك نازانێ خۆشەویستی چییە، بەڵکو پەیوەندییە جەستەییەکانیشی لەگەڵ ژن جۆرێکە لە لاقەکردن.

من: سەرمایەداریی ناوێکی تری پیاوسالارییە. ئەگەرچی بە رواڵەت وا دەردەکەوێت ئەم سیستمە تەکانێکی بە ئازادیی و دەستەبەری مافی مرۆڤ داوە، کەچی لە راستیدا ئەم تەنیا دیوی دەرەوەی ئەم باوەڕە هەڵەیەیە، فوکۆ لە کتێبی «دیسپلین و سزادان»دا بە روونیی تیشك دەخاتە سەر ئەم پرسە، ئەو

بەوردی ئەو هێڵە درامییەی ستەمکاری دەدۆزێتەوە کە لەسەردەمی دێرینەوە درێژ بۆتەوە بۆ سەردەمی سەرمایەداری «مودێرنە». ئەو لەوێدا پێیوایە ئەوەی گۆڕاوە تەنیا شێوازە ئاشکراکەی سزادان و کۆنترۆڵکردنە، ئەگەرنا لە سەردەمی مودێرندا ئەم داپڵۆسین و جڵەوکردنە بە شێوەی شاراوە و بێ ویژدانانەتر بوونی هەیە، ئەویش پێش هەر شتێك دەستە بەسەرداگرتنی بیر و هۆشە لە رێی کارگە و قوتابخانە و دامەزراوە سەربازییەکان و دەسەڵاتی ماسمیدیاوە، بە دیتنی فوکۆ ئەمانە جێگەی زیندانە نەریتییەکانی «چاخی کلاسیکی»یان گرتۆتەوە. کەواتە خودی سەرمایەداری سروشتێکی درندەی هەیە، لەسەر باڵادەستیی چین و توێژەکان بینا کراوە، لەم نێوەندەدا مێینە چەندان جار چەوساوەترە، ئەمە دووپاتکردنەوەی قسەکەی «ئەنگلس» نییە بەڵکو فاکتێکی روونە، ئەو مافەی سەرمایەداری بە مێینە داوە تەنها مافی بە کاڵابوونە.

خۆم: کرۆکی قسەکردنمان لە بارەی خۆشەویستییەوە بوو، بەڵام خۆشەویستی لەنێوان مرۆڤەکاندا دەکرێت، مرۆڤیش مەحکومە بە جۆری بیرکردنەوە و ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی. جارێك ئەریستۆ وتی «لە ناو هەموو زیندەوەران تەنیا مرۆڤ دەتوانێت پێبکەنێت»، بیر لەوە دەکەمەوە تەنیا مرۆڤیشە دەتوانێت خۆشەویستی بکات، تەنیا مرۆڤیشە دەتوانێت بگرێ و ببێتە هۆکاری گریاندنی مرۆڤی تر. بۆ ئەوەی خۆشەویستی بگەڕێتەوە ناو دڵی ئینسان، دەبێت جارێکی تر دەستکاریی دنیا بکەین، هیچ نەبێت لانیکەم

وەك «ئۆرهان پامۆك» بوێر بین و بڵێین «بیر لەوە دەکەمەوە، لە چاوی ژنانەوە باسی دنیا بکەم». سەیرکردنی دنیا لە چاوی ژنـەوە لانیکەم کۆمەکمان دەکات بۆ راستکردنەوەی ئەم جیهانە لنگەوقوچەی هەنووکە کە هیچ خۆشەویستییەکی تێدا نەماوە.

من: منیش پێموایە بۆ ئەوەی خۆشەویستی بگەڕێتەوە بۆ ناو ژیانمان، پێویستە ماڵی ئەندێشەمان لە نێرسالاری پاك بکەینەوە، ئەوەی من دەتوانم بە دڵنیاییەوە پێت بڵێم ئەمەیە: هیچ پیاوسالارێك ناتوانێت خۆشەویستی بکات.

٢٠١٨-١٢-٩

کاتژمێر: یانزە و دە خولەکی پێش نیوەڕۆ

نەخۆشخانەی بیلەفێلد میتە

-١٣-

خۆم: بڕوا دەکەم ئێمە زمانمان تەنانەت بیرکردنەوەمان لە چاوماندایە، چاوێك تەنیا توێکڵی شتەکان دەبینێت، دەستی ناگات بە جەوهەریان. هەر بۆیە جیهانبینی ئێمە بۆ خۆشەویستی، سێکس، مردن، کەینونە، تەنیا فۆرمالیستانەیە. لە بارەی هەموو شتێکەوە دەدوێین بێ ئەوەی هیچمان وتبێت، هەموو شتێك دەبینین بێ ئەوەی هیچمان بینیبێت!. یەقینمان بە ئایدیاکانمان هەیە، بێ ئەوەی هیچ ئایدیایەکمان هەبێت. خۆشەویستی دەکەین بێ ئەوەی خۆشەویستی بکەین، دەژین و هەناسە دەدەین بێ ئەوەی ژیان بکەین. ئێمە کێشەیەکی گەورەی ئەپستمۆلۆژیمان

هەیە.

من: مرۆڤی ئێمە «کورد» بوونەوەرێکی ئاکتوێل نییە، لە رووی بیر و تێڕامانەوە، لەنێوان هەردوو قۆناغی «لاهوت» و «میتافیزیکیا»دا چەقیوە، بەو پێیەی «ئۆگەست کۆنت» گەشەی بیری مرۆڤ بەسەر سێ قۆناغدا دابەش دەکات، ئەوانیش قۆناغی «لاهوت و میتافیزیك و پۆزەتیڤ»ن، لە هەردوو قۆناغی لاهوت و میتافیزیکیادا، عەقڵ یان با بڵێین زانست بڕیار نادات، بەڵکو ئەفسانە و غەیبانییەت و باوەڕە ئەودیو سروشتییەکان ئاراستەی بیر دیاری دەکەن، بەڵام لە قۆناغی پۆزەتیڤیزمدا فاکت و سەلماندنی زانستی دوا قسە دەکەن. ئەم قۆناغەش رۆحی «مۆدێرنێتە»یە، کە تیایدا عەقڵ لە بەرزترین ئاست رۆڵ دەگێڕێت، لێ هەندێك پێیانوایە مۆدێرنێتە لە ئاوابوون نزیك بۆتەوە یان لە سەرەمەرگدایە کەچی «یۆرگن هابرماس»ی دوا فەیلەسووفی قوتابخانەی فرانکفۆرت هێشتا بەرگریی لە مودێرنە دەکات وەك قۆناغێکی ئاکتۆیل. بەهەر حاڵ ئێمە بەر دیاردەکانی مۆدێرنێتە کەوتووین، بەڵام گەوهەرەکەی کە بریتییە لە سیستمێکی عەقڵانی هێشتا بە ئێمە نەگەیشتووە، بەو پێیەی مۆدێرنێتە تەنیا ئەو ماتریاڵە تەکنۆلۆژیانە نییە بە ئێمە گەیشتوون.

خۆم: ئەفسانە تەنیا ئەو واتایەی نییە رووداو یان زنجیرە رووداوێك بێت، لە دەرەوەی سیستمی عەقڵ یان لەناو عەقڵی ئامێریدا جێی نەبێتەوە، ئەمە ئیشکالیەتێکە «میرسیا ئیلیاد»

پێداگریی لەسەر دەكات و وا بیر لە بابەتەكە دەكاتەوە ئەو پێناسەیەی پێیوایە ئەفسانە هەموو شتێكی دەرەوەی واقیع دەگرێتەوە، زمانێكە لەلایەن پۆزەتیڤیزمەوە لە سەدەی نۆزدەهەمدا داهێنراوە, كەچی ئێمە هیچ كات ناتوانین رەهایانە ئەفسانە رەت بكەینەوە، چوونكە بنیادی رۆشنبیریی و كولتووری مرۆڤایەتی لەسەر دامەزراوە. ئێمە دەبێت لەم جیهانە شێواوەدا لە ئەفسانە بگەین، هەروەك چۆن فرۆید توانی لە رێی ئەفسانەی «ئۆدیب پاشا»ەوە كەشفی نەخۆشییەكی دەروونی گەورەی مرۆڤ بكات. لەلایەكی ترەوە هیچ نەتەوەیەك دروست نابێت، بەبێ ئامادەگیی ئەفسانە وەك توخمێكی بەهێز لە پرۆسەی نەتەوەسازییدا.

من: هەرچەند ئەفسانە وەك بناغەیەكی كولتووریی رەت ناكەمەوە، بەڵام باسم لە شتێكی تر دەكرد، دەمەوێت سەرنجت بۆ ئەوە رابكێشم لایەنگری مودێرنە نیم، بەو هۆكارەی پێشكەوتنە رۆمانسییەكانی لەكەدارە، لەناو مودێرنەدا، ماركس لە دایكبوو كە بێ بەزەییانە رەخنەی توند و رادیكاڵانەی ئاراستە كردووە. «ئالان تۆرین»ی فەیلەسووفی هاوچەرخی فەرەنسیش دیدێكی وەها دەخاتە روو: كە ئەو جیهانە ئازاد و لیبراڵ و بەختەوەرەی مودێرنەی پێ دەناسرایەوە، وێنە گشتگیرەكەی تێكشكاوە، بەو پێیەی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە ژمارەیەك بیریار و فەیلەسووف قەیرانە سترۆكتۆرییەكانی مودێرنەیان ئاشكرا كردووە. ئەمە لەلایەك و لەلایەكی تریشەوە باسم لە

پێشکەوتنی بیر کرد بەپێی ئەو قۆناغانەی «ئۆگەست کۆنت» دیاری کردوون، لەگەڵ ئەمەشدا ئەفسانە وەك بەشێك لە قۆناغی لاهوتی لە فۆرمە سەرەتاییەکەیدا زمانی عەقڵی مرۆڤ دێرین بووە، وەلێ وەك «میرسیا ئیلیاد» هێمای بۆ کردووە جیهانی مودێرنیش کۆمەڵێك ئەفسانەی نوێی تایبەت بە خۆی بەرهەم هێناوە.

خۆم: کەواتە خۆشەویستی لە سەردەمی مۆدێرنێتە، ئەدگاری چۆنە؟. دەمەوێت بەم پرسیارە بخزێمە ناو پرسێکی ئاڵۆزەوە، رەنگە ئەمە ئەو پرسیارە زۆر گرانە بێت، وەڵامێکی دڵنیا و ئاسانی نەبێت، یان وەڵامێك نەبێت بتوانێت هەموو رەهەندەکان ئەنالیز بکات.

من: مودێرنە لە راستیدا ناوێکی تری عەقڵی ئامێرییە، لە رووی ئابوورییەوە مودێرنە سەرمایەداریی بەرهەمهێنا، لە رووی سیاسییەوە دەوڵەت نەتەوەی دروستکرد، کە بریتییە لە سیستمی دیسپلینسازیی و چاودێریکردنی هاوچەرخ. خۆشەویستی لەم چوارچێوەیەدا لە ژێر هەڕەشەدایە، لە سۆنگەی ئەوەی لە بری خۆشەویستی، مودێرنە هەڕمێن بە چێژگەراییەکی ئەبستراکت دەدات، هەروەك فوکۆ باسی دەکات مۆدێرنێتە بریتییە لە رەوشی ئاسایکردنەوەی شتە نائاساییەکان، بە هەمان شێوەش نائاساییکردنەوەی بابەتە ئاساییەکانە!. ئەمە جیا لەوەی مودێرنە هەمیشە بەشێکە لەو خەیاڵدانەی جیهانی خۆرئاوا بە ناوەند پێناسە دەکات و هەڵگری ئەو نەزعە سێنترالیزمەیە لە هیگلەوە بگرە پێش

ئەویشەوە درێژ بۆتەوە تاکوو رۆژگاری ئەمرۆمان، لەناو ئەم نەزعەیەدا منێکی رۆژهەڵاتی بۆ ئەوەی بێمە ناو دنیای مودێرنەوە دەبێت پۆشاکی رۆژهەڵاتیيانەی خۆم دانێم، ئەمە شتێکە فوکۆ لە کتێبی «وتەکان و شتەکان»دا بە روونی باسی لێوە دەکات کە مودێرنە ناتوانێت خۆشەویستی دروست بکات و رۆژهەڵات و رۆژئاوا پێکەوە کۆبکاتەوە.

خۆم: لەو باوەڕەدام ژیاری ئێستای مرۆڤایەتی تەنیا لەسەر عەقڵی پەتی وەستاوە «وشەی عەقڵی پەتیم لە کانت خواستووە». لەم شارستانێتییەی رژێمی سەرمایەداریی و دەسەڵاتی بۆرسە و کۆمپانیاکاندا، هەستی مرۆڤ بەهایەکی ئەوتۆی نییە، مرۆڤی نوێ یان هاوچەرخ فۆرمێکی تازەترە لە کالیگۆلا، درەندەیە بێ ئەوەی هەست بکات هەموو شتێك لەسەر دەستی بەرەو پایان دەچێت. لە کاتێکدا ژاك لاکان و کۆی ئیمپریستەکانی تر تەنانەت خودی زانستیش وەك دەرهاویشتەی هەست دەبینن، هەرچەند بە تەواوەتی لەگەڵ ئەوەم زانست بەرئەنجامی وەگەڕخستنی عەقڵە، بەڵام بۆ من هەستیش گرنگییەکی لە رادده بەدەری هەیە. لێ باش لەوە تێدەگەم مرۆڤە هەستیارەکان لەم شارستانییە نوێیەدا پێناسەکانی شێتیان بەسەردا پراکتیس دەکرێت.

من: ئەندرێ ژید رایەکی زۆر سەیری هەیە کاتێك دەڵێت «بە هەست و سۆزی جوان، مرۆڤ ئەدەبی خراپ دادەهێنێت»! لێرەدا روونە هەست پێچەوانەی عەقڵە، ئەگەر زانست تەنانەت ئەدەبیش پێویستیان بە هەست و

سۆز نەبێت، ئەوا پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و ژیانی کۆلەکتیڤی مرۆڤ دەیخوازێت، ئەو رادده بەرزەی وەگەڕخستنی عەقڵ کە شۆڕشێکی تەکنۆلۆژیی گەورەی هێناوەتە ئارا، سەرباری هەر ئاسانکارییەك بۆ ژیان بە ئەندازەیەکی زۆرتر تەنگەبەری بۆ دروست دەکات، بەو پێیەی مرۆڤ لە هەست دادەڕنێت و وەك کۆمپیوتەرێك تەنیا بە ژیرانە کار دەکات. ئەگەرچی ماتریالیستم، بەڵام مرۆڤ تەنها وەکوو ماتەرێك نابینم، زانست خۆی ئەوەی سەلماندووە تەنیا پێنج دەر سەدی پێکهاتەی جیهان لە ئەتۆم پێکهاتووە. لەم روانگەوە بە قەد عەقڵ، مرۆڤایەتی پێویستی بە هەستی مرۆڤانە هەیە، ئەگەرنا سەرباری هەر پەرەسەندنێکی عەقڵی و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا، مرۆ لە دۆخی دڕندایەتی رزگار نابێت. هەروەك ئەمەی ئێستا.

خۆم: مودێرنە هەر زوو وەرچەرخا بۆ دیسپۆتیزمێکی نوێ لەسەر دەستی رژێمی کاپیتالیزم، ئەگەر لە ناو مودێرنەدا، وەك تۆ ئاماژەت پێدا ئەگەر مارکس هەبێت، بە دیوەکەی تردا «هیتلەر و فرانکۆ و مۆسۆلینی»ش هەن، بە مانایەکی تر فاشیزم و نازیزم دوو دەرهاویشتەی ئێجگار وەحشەتناکی مۆدێرنێتەن، لە راستیدا هەوڵەکانی یورگن هابرماس بۆ هاوسەنگگرنەوەی مۆدێرنێتە و گونجاندنی بە فۆرمێکی هارمۆنی لەگەڵ ژیانی راستەقینەی مرۆڤ، زۆر ترازیدیی کەوتۆتەوە، بەو پێیەی مۆدێرنێتە لەمە زیاتری پێ نییە بۆ مرۆڤایەتی.

من: خەیاڵێکی تۆقێنەرم هەیە. هەنووکە زەوی زۆر ماندووە، کەشوهەوا تێکچووە، باڵادەستی تەکنۆلۆژیاش لەسەر وێرانکردنی زیاتری ئەم هەسارەیە راوەستاوە، مرۆڤ گەیشتۆتە رادەیەکی پێشکەوتنی وەها گەڕانەوەی بۆ نییە، لەم ئانوساتەدا درامییەدا، کە توێژینەوە میتۆرۆلۆژییەکان هەموو زەنگەکانی مەترسییان لێداوە، پەی بەوە دەبەم ژمارەیەك مرۆڤ هەن دەیانەوێت بە یارمەتی تەکنۆلۆژیا هەواری خۆیان بەرەو هەسارە یان ئەستێرەیەکی تر بگوازنەوە، لەوێوە شانشینی خۆیان لە ئاسمان دابمەزرێنن و فەرمانڕەوایی بکەن بەسەر زەوینشینیناندا، تۆ هیچ کات بیرت لەم ئەگەرە تۆقێنەرە نەکردۆتەوە؟، ئەمە تەنیا خەیاڵێك نییە، بەڵکو ئەگەرێکی بەهێزیشە. ئەگەر ئەوە ببێتە دیفاکتۆ، کەواتە رەوشی ژیان لێرە چۆن دەبێت؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە منی سەرقاڵ کردووە بەخۆیەوە.

خۆم: بێگومان ئەوە ئەگەرچی خەیاڵیش بێت، بەڵام خەیاڵ سەرچاوەی هۆشمەندیی و زانستە، بە وردبوونەوە لە سینەمای «هۆلیۆد» ئەم خەیاڵە زانستییە ئەگەرێکە و لە مێژە کاری بۆ دەکرێت، لەو سینەمایەدا نموونەی ئەمەریکی وێنایەکی سوپەرە، تەنانەت لە شەڕی مرۆڤ و بوونەوەرە ئاسمانییەکاندا ئەمەریکا سەرکردایەتی زەوی دەکات، لە ئەگەرێکی لەو چەشنەی تۆ باسی دەکەیت، ئەو شانشینە ئاسمانییە ئاڵای ئەمەریکای لەسەر چەقێنراوە، لەوانەیە کۆشکی سپی بگوازنەوە بۆ ئاسمان، دیمەنێکی سوریالییە،

بەڵام مومکینە، چوونکە وەك ئاماژەمان پێدا عەقڵی ئامێریی هەر جۆرە هەست و خۆشەویستییەکی کردووە بە چێشتێکی فۆلکلۆریی کە هارمۆنی نییە لەگەڵ ئەوەی مرۆڤی نوێ دەیخوازێت.

من: بابەتەکە بەرەو شوێنێکی تر، رۆیشت، ئەمە وتەزایەکی گرنگی «محەمەد شوکری»م، وەبیر دێنێتەوە کە دەڵێت «ئاسیا سەرەتای مێژووە، ئەوروپاش بەشێوەیەکی رەها کۆتایی مێژووە». بێزاریی لەوەی «ئەوروپا بۆتە کۆگایەکی مێژوویی چەك و تەقەمەنی» مرۆڤی ئەوروپایی تووشی شۆك کردووە و بە دوای جوگرافیای خەونەکانیدا دەگەڕێت، ئەگەر ئەوروپییەکان لە مێژوودا بە دوای سەرچاوەکانی زێڕدا گەرابن لە دۆزینەوەی ئەمەریکادا، ئێستا بە دوای ئایندەی خۆیانەوەن لەو کیشوەرەدا، ئەمە دیاردەیەکە لە «ناپلیۆن»ەوە درێژ بۆتەوە تاکو ئەم چرکەساتەش. ئێستا کە باسی خۆرئاوا یان باکوور دەکرێت، رووی دەممان لە ئەمەریکایە، سیاسەتی ئەمەریکیش بزوێنەری سیستمی چینایەتییە، بەو ئەندازەیە بەرەو هەڵکشان دەڕوات کە بیر لە شانشینێکی ئاسمانی دەکاتەوە.

خۆم: لەوە دەچێت بانگەشەی لایەنگریکردن پۆست مۆدێرنێتە بکەیت، بەو پێیەی روانگەکانت هەم دژی زانستە، کە ئەمەش بەشێوەیەك لە شێوەکان لای مارتین هایدگەر دەردەکەوێت، هەم لە دژی ئەو راپەڕینە عەقلانییەی لە رۆشنگەرییەوە دەستی پێکردووە، وەك لە ناوەکەشیدا

دەردەکەوێت پۆست مودێرنە، درێژەپێدەری مودێرنە نییە، بەڵکو لە بەرزترین ئاستدا رەتکەرەوەیەتی.

من: پۆست مودێرنە، یەك فۆرمی کۆنکرێتی نییە، بەڵکو چەمکێکی ئاڵۆزە، بە دیدی لایەنگرانی ئەم بزاڤە هەموو شتێك بەرهەمی زەمەن و رێکەوتە، بۆیەکا هەر شتێك لە دەوروبەرماندا بەشێوەی رەها لە ئارادا نییە، بەڵکو هەبوونێکی نیسبیان هەیە، ئەمە بە خودی زانست و راستیی و ئاینەکانیشەوە، تەنانەت جیاوازیی نابینن لە نێوان زانست و جادوودا، جیا لەمەش پۆست مۆدێرنێتە تەواوی جیهان وەك گرتەیەکی ڤیدیۆیی دەبینێت، ئەمەش لە روانگەی «بۆردیار»ەوە دەردەکەوێت کە نکۆڵی لە ئۆپەراسیۆنی سەربازیی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق دەکرد و وەك ئەکشنێکی سینەمایی دەیبینی، ئەمە جیا لەو بێمانایيە خنکێنەرەی ئەوان تێی کەوتوون، بۆیە ئۆکتاڤیۆ پاز هەمیشە لە بارەی لاتین ئەمەریکاوە دەیووت پۆست مودێرنە بە کاری ئێمە نایەت، منیش رایەکی نزیك لەوم هەیە. جیهان لە بۆشاییدایە، دەبێت مرۆڤ بیر لە پاشەڕۆژی خۆی بکاتەوە، ئەوەی هەیە هەموو بەرەو دارمان دەڕوات.

خۆم: هیچم نەماوەتەوە بۆ وتن. بۆ ئەم پایزی مرۆڤایەتییە، تەنیا دوو دڵۆپ فرمێسکی روونم هەیە.

٢٠١٨-١٢-١٦

کاتژمێر: شەش و سی و پێنج خولەکی بەیانی

«وردە وردە بەفر دەبارێت»

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس - شتاسیۆنی نۆرۆلۆگی

-١٤-

من: ئەوەی من بڕوام پێیەتی ئەمەیە، مرۆڤ بوونەوەرێکی ئاڵۆزە و تێگەیشتن لێی ئاسان نییە، هەرچی داهێناوە و هەرچی دەکات بۆ زیاتر ناسینی خۆیەتی، زانست و ئەدەب و فەلسەفە بۆ لێکدانەوەی ئەو ئاڵۆزییە تێدەکۆشن، ملیارەها ساڵە مرۆڤ بە فۆرمی جیا جیا لە خۆدۆزینەوەدایە، هەر جارەش شتێکی نوێ و جیاوازتر لە خۆیدا کەشف دەکات، باوەڕ دەکەم هێشتاش نەگەیشتۆتە نیوەی ڕێ. تێگەیشتنی مرۆڤەکان کە هەریەکەیان جیهانێکی تایبەتی پڕ گرێوگۆڵ و نیمچە ڕووناکن، لە ڕێگەی زمانەوە نییە، زمان ئامرازی مامەڵەکردنە، بەڵام خۆشەویستی کلیلی دەرگاکەیە تا تۆ بچیتە ناو جیهانی مرۆڤێکی ترەوە، ئەگەرچی خۆشەویستیش دەستەپاچەیە لە دەستراگەیشتن و بینینی هەندێك جوگرافیای تاریك و ئاڵۆزکاوی جیهانی تایبەتی مرۆڤ، بەڵام لە خۆشەویستی بەولاوە شتێکی ترمان نییە بۆ ئەو کارە.

خۆم: جارێك وتتان مرۆڤەکان لە ڕێگەی شیعرەوە لە یەکتر تێدەگەن، شیعریش دواجار گوتنە، هەروەك چۆن ئەدۆنیس جیاوازیی زۆر لە نێوان زمان و گوتندا دەبینێت. شیعر جیهانێك دادەهێنێت مرۆڤەکان تێیدا لە یەکتر تێدەگەن، بەڵام خۆشەویستی شتێکی ترە و کاتییە، ئەمە شتێکە چوار سەدە پێش ئێستا «پاسکاڵ» بیری لێ دەکردەوە، کە «ئێمە هەرگیز کەسمان خۆشناوێت، بەڵکو تەنها هەندێك سیفەتمان خۆش دەوێت و هیچی تر». لای پاسکاڵ ئەو سیفاتانە هەرگیز «من»

دروست ناكەن، بەو پێیەی سیفاتە مرۆییەكان ئەزەلی نین، هەروەك چۆن ئاوڵە جوانی رووخسار لەناودەبات بێ ئەوەی خودی مرۆڤەكە لە بەین بچێت، ئەو رووخسارە جوانە كە فاكتۆرێكی خۆشەویستییە بینیمان جاویدانی نییە، هەروەها بۆ سیفەتەكانی تریش بە هەمان شێوە. لێرەدا باوەڕم وایە خۆشەویستی داهێنراوە، تەنیا بۆ ئەوەی ئەو هەقیقەتە لە بیر بكەین ئێمەی مرۆڤ نە لەگەڵ یەكتر هەڵدەكەین و نە بێ یەكتر هەڵدەكەین.

من: پەندێكی دێرین هەیە دەڵێت «كە ئەسپ نەبوو، زین لە كەر دەنرێت». دەبێت مرۆڤ بەدوای ئەوەدا وێڵ نەبێت نییە، بەڵكو دەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەوەدا بكات هەیە، خۆشەویستی تاكە شتە ئێمە كۆبكاتەوە بە یەكەوە، لەوە بەولاوە چیتر هەیە؟. تۆ وتەزاكەی «پاسكاڵ»ت هێنایەوە وەك ئارگۆمێنتێك، بەڵام لە بیرت كردووە هەر ئەو لە جێگەیەكی تردا دەڵێت «جوانی ژیان لەوەدایە بە خۆشەویستی دەست پێبكات و بە خواست و ئارەزوو كۆتایی پێ بێت». ئەگەرچی چەمكی خۆشەویستی لەكۆنتێكست و دیدی میتافیزیكی «پاسكاڵ»دا روانگەیەكی لاهوتی و مەسیحییانەی هەیە، بەڵام خودی خۆشەویستی وەك ناوەڕۆك لە دەرەوەی سیاقە مێژووییەكانە، دەشێ پێناسەكان بە پێی شوێنكات بگۆڕدرێن، بەڵام ناوەڕۆكی خۆشەویستی هیچ كات ناگۆڕێت. سەبارەت بە شیعر رایەكم هەیە ئەگەرچی دەزانم لێم قبوڵ ناكرێت، شیعر یان گوتن شتێكە خۆشەویستی دایهێناوە،

نەك بە پێچەوانەوە، شیعر گەمەیەکی ئەبستراکتی زمانەوانی نییە، بەڵکو بەرهەمهێنانەوەی خۆشەویستییە لە فۆرمێکی تازەتردا.

خۆم: لە ئەفسانەی «گلگامێش»دا، کاتێك خۆشەویستی خواوەند «عەشتار» رەت دەکاتەوە، رستەیەکی سەرەتانی هەیە، چرکەساتێك گلگامێش بەرەو رووی عەشتار دەڵێت «تۆ کامە عاشقی خۆت بە بەردەوامی خۆشویستووە؟». ئەمە تەنیا رەخنەگرتن نییە لە سروشتی سۆزانیانەی عەشتار، بەڵکو ئەوەیە خۆشەویستی دەکەوێتە ژێر حوکمی زەمەنەوە، خۆشەویستییەك لە ئارادا نییە بەپێی رێسای ماتماتیکی ژمارەکان کە هیچ کۆتاییەکی نەبێت، خۆشەویستی مرۆڤ هەروەك ژیانی خۆی نەمر نییە، بگرە کورتترە لە ژیانی خۆی، «لێرەدا باس لە خۆشەویستی ژن و پیاوە». جیا لەمەش خۆشەویستی مرۆڤی ترانسێندێنتاڵ دروست ناکات، بەڵکو هەمیشە مرۆڤەکان لە باری سترێس و نادڵنیاییدا رادەگرێت، جەنگێکە بە بێ گرمەی تۆپ و تانك. بەدەر لە هەموو ئەم فاکتانەش ئێمەی مرۆڤ مەحکومین بە کردەی خۆشەویستی.

من: باوەڕم وایە مرۆڤی عاشق کەسێتییەکی «گالیڤەر»ی هەیە، هەندێك جار هەست بە ترانسێندێنتاڵی خۆی دەکات، بە پێچەوانەشەوە. خۆشەویستی تەنیا کردەیەکە دەروون و جەستە و تەواوی هەبوونی خود بەشداری تێدا دەکات، تاکو ئێستا ئاناتۆمییەکی پزیشکیی بۆ عاشقێك نەکراوە، لەو کاتەی دڵی دەکەوێتە خورپە یان هەست بە خۆشی و

شوهدێك دەكات، چی بەسەردا دێت لە رووی بایۆلۆجییەوە، ئێمە تەنیا لەناو تەئەمولاتدا لە خۆشەویستی دەڕوانین، بەڵام پێموایە خۆشەویستی پەیوەندیی ئۆرگانیکی و پتەوی هەیە بە مێشکەوە، لە سۆنگەی ئەوەی زانستی نوێ بوونە ماتەرییەکەی مرۆڤ تەنها بە قەباغ و یەکگرتنی ئەتۆمەکان ناناسێنێت، بەڵکو ئێنرژی بەشێکە لە وجــودی، من خۆشەویستی بە ئەو وزەیە دەبینم، کە دەتوانێت کاربکاتە سەر هۆش و ئاگامەندیی و تەنانەت بۆدی هەر مرۆڤێك. تۆ پێویستە ئەم میناتۆرییە ببینیت لە ناو تابلۆ گشتییەکەدا.

خـۆم: ئـەوە راسـت و تـەواوە مێشکی مـرۆڤ دەزگایەکی گەورەی بەرهەمهێنانی بیر و ئینرژییەکانە، تەنانەت مێشکی مرۆڤ قابیلیەتی ئەوەی هەیە لە یەك وانەدا سەد هەزار وشە فێر بێت، یان ئەو توانایەی هەیە لە ماوەی یەك هەفتەدا زمانێك فێر ببێت، توانای ناسینەوەی دە هەزار کەسیشی هەیە لە تەنها ساڵێکدا، کەچی ئەوەی سەیرە ئەم مێشکە هەمیشە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەویتر، رق و دەستبەراگرتن بەکارهاتووە، ئەو مێشکانەی خۆشەویستی بەرهەم دەهێنن یەك لە ملیۆنی ئەو مێشکانە نین کینە دروست دەکەن، رق و کینەش ئەو مانا کلاسیکییە ناگرێتەوە لە حکایەتە فۆلکۆرییەکاندا باسی لێوە کراوە، بەڵکو ئەو تەکنۆلۆژیایە دەگرێتەوە، مارتین هایدگەر بە نەریتێکی میتافیزیکیی پێناسەی دەکات، کە لە دواجاردا شارستانێتییەکی هیچگەرا و ئەنتی خۆشەویستی وەك جیهانی ئەمرۆی لێکەوتەوە.

من: بادیۆ ئەگەرچی چەپێکی رادیکاڵ و فەیلەسوفێکی شۆڕشگێڕە، دەشزانین شۆڕشگێڕیی بە سروشتی خۆی دژە عەشقە، بەڵام ئەو بە چاوکردن لە ئەفلاتۆن دەڵێت «بەبێ خۆشەویستی فەلسەفەش لە ئارادا نییە». لێرەدا تانوپۆی خۆشەویستی ئێجگار لەوە گەورەترە بۆ پەیوەندیی خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو کورت بکرێتەوە، بەڵام سەرئەنجام خۆشەویستی ژن و پیاو دیوە هەر ریالیتی و ئیستاتیکییەی کردەی خۆشەویستییە. تەنانەت دیکتاتۆرەکانیش بچووك بوونەتەوە لە بەردەم خۆشەویستی ژنێکدا «هەڵبەتە زۆرینەی دیکتاتۆرەکانی ناو مێژوو پیاوانن». خۆشەویستی هۆرمۆنێکە بەبێ ویستی ئەوەی کێیت و لە چ پێگەیەکی ئابووری و کۆمەڵایەتیدایت، مێشکت دەرِبدات. بیر لە شانۆنووسی سوێدیی «ستریندبێرگ» دەکەمەوە کاتێك عاشقی ژنێکی مێردار دەبێت، لە نامەیەکدا بۆی دەنووسێت «ئاگرەکەی من، مەزنترین ئاگرە لە سوێددا». دەبێت ئەم خۆشەویستییە جیاوازتر بووبێت لە خۆشەویستی «هیتلەر» بۆ «ئیڤا براون»؟ بە دڵنیاییەوە دەڵێم نەخێر، هەر عاشقێك ئاگرەکەی خۆی پێ گەورەترە، ئەو ئاگرەی خۆشەویستی لە ژیانی هەر مرۆڤێك بەربێت، دەیکاتە مرۆڤێکی راستەقینە.

خۆم: خۆشەویستی تەنیا هەر ئاگر نییە، بەڵکو ئاویشە، هەروەك «نالی» لە شیعرێکدا دەڵێت: «ناری سینەم گەز نەبێ غەرقم ئەمن.. ئاوی چاوم گەر نەبێ سووتاوم ئەز». ئەگەر ئەو ئاوەی چاو نەبێت هەموو دەسووتێین، ئەگەرچی ئەو ئاگرەش

نەبێت تێکڕا نقومی دەریای فرمێسك دەبین. هەروەك چۆن «سالۆمی» لە شیعرێکدا بۆ «فرۆید» باسی هەمان ئاگر دەکات و بە چێژی سووتان وەسفی دەکات. کەچی وەك ئەوەی خۆشەویستی سەر بە ئەمڕۆ نەبێت، ڕەنگی کاڵتر بۆتەوە، بەڵکو لەم چاخی سەهۆڵبەندانە جێی ئاگری خۆشەویستی نابێتەوە، ئینسانەکان سەرقاڵی شتی لابەلا کراون، تا بیر لە خۆشەویستی نەکەنەوە، چون ئەم دنیا نادادپەروەرە بە چەکی خۆشەویستی نەبێت لەناو ناچێت، پێموایە شۆڕشی راستەقینە گەڕاندنەوەی خۆشەویستییە بۆ ئەو ئەو مرۆڤەی، نیتچەی گەیاندە ئەوەی بڵێت لە مەیموون مەیموونترە.

من: دروست هاوڕای ئەم دیدەم، من لە دەلاقەکەی ترەوە دەچمەوە ناو ئەم باسەوە، مرۆڤبوون لەژێر پرسیاردایە، وەك جارێك فەیلەسووفی ئەڵمانی «پیتەر سلۆتەردایك» نووسیبووی «ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، ئەنترۆپۆلۆجیا زانستیکی راستەقینە دەبوو»!، کەواتە لە کوێدا مرۆڤایەتی لە ژێر پرسیاردایە؟. لێرەدا لەو فەیلەسووفە جودا دەبمەوە و دەڵێم بە هۆی موڵکایەتی تایبەتەوە!!، کە بە بڕوای «پرۆدۆن» موڵکایەتی تایبەت «دزییە» و «لە رێگەی دەست بەسەراگرتن و داگیرکارییەوە دروست دەبێت». کەواتە ئەمە چ پەیوەندییەکی بە خۆشەویستییەوە هەیە؟. من لێرەدا تاڵە مووەکەی معاویە ئاشکرا دەکەم، بەو پێیەی تا مرۆڤ هەوڵی دەستبەراگرتنی مرۆڤ بدا، خۆشەویستی تەنیا لە درۆیەك زیاتر نییە. تاکو ژن موڵکی پیاو بێت، خۆشەویستی درۆیە!! مرۆڤایەتی کاتێك

هەیە هەردوو رەگەز بەشێوەیەکی هاوسەنگ ژیان و مافەکانیان پیادە بکەن. یەکێکیش لە دەرهاویشتە هەرە پۆخڵەکانی مۆدێرنێتە دیاردەی لەشفرۆشییە، ئەمەش بە خۆشەویستی دەرمان دەکرێت، چوونکە خۆشەویستی دژی موڵکایەتی و بە کاڵاکردنە. بە پشت بەستن بەم راستییە ساکارانە دەتوانین ئەوە بڵێین خۆشەویستی لەم چەرخەدا زەلیلە، هەروەك هەموو شتەکان ملکەچی ئەقڵی ئامێریی بووە، وەك هەموو پێدراوەکانی تر لاقە کراوە و کراوەتە دیاردەیەکی دیجیتاڵی فەزای دنیا مەجازییەکەی تەکنۆلۆژیا.

خۆم: ئەمە راستییەکی زۆر خنکێنەرە، بەڵام دڵخۆشم بەوەی بە ئاوابوونی ئەم سیستمە پیرەی سەرمایەداریی جارێکی تر، بەهارێك دێتەوە خۆشەویستی تێدا بڕوێت، هەروەك ئەوەی مارکس وتی «گوڵ لێرەیە، لێرە سەما بکە».

من: هەرچەند زۆر گەشبین نیم وەك تۆ، بەڵام با هەمیشە خەیاڵی جوان بکەین، وەك ئەوەی «کیتس» لە دێڕە شیعرێکدا دەڵێت «با هەمیشە خەیاڵ گەشت بکات». خەیاڵی من هەمیشە لە گەشتی ئەو دنیایەدایە خۆشەویستی بینای کردووە، دەمەوێت هاوڵاتییەکی ئەو شارە یۆتۆپییەی ناو خەیاڵەکانی خۆم بم.

٢٥-١٢-٢٠١٨

کاتژمێر: شانزە و بیست و حەوت خولەك

رۆژی کریسمسە، شار خامۆش و سەرمایەداران

گیرفانیان پڕتر کرد بەم رۆژە

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-١٥-

خۆم: نامەوێت وەك «هۆسرەل» بچمە هەوڵی بەراوردكاریی نێوان لەش و جەستەوە، ئەوەی جێگەی بایەخمە لێرەدا، ئەوەیە: جەستە تەنها پێدراوێكی بایۆلۆژیی و فیزیكیی نییە، بەڵكو رەهەندێكی وجودیشی هەیە، تاكە رایەڵە مرۆڤ و بوون پێكەوە گرێبداتەوە، بەدیوێكی تردا مرۆ ناتوانێت هەست بە هەبوونی خۆی بكات لە رێگەی جەستەوە نەبێت، هەر كات جەستە فیزیكییەكە لەناوچوو، چیتر ناتوانین هەست بە بوون بكەین، كەواتە مێژووی مرۆڤ بریتییە لە مێژووی جەستە. لەگەڵ ئەمەشدا تاكو رادەیەكی زۆر باوەڕم بەو تێزە «دیكارت»ییە هەیە كە لە ئەرەستۆوە درێژەی پێدراوە و جەخت لەسەر پەیوەندیی تۆكمەی نێوان جەستە و دەروون دەكاتەوە، بەڵام لەدیتنی مندا جەستە پێش هەموو شتێكی تر كەوتووە، تاكو جەستەیەكی بایۆلۆژیی لە ئارادا نەبێت دەروونێكیش لە ئارادا نییە. ئەمەش ژەنینەوەی هەمان ئەو ئاوازەیە «سپینۆزا» بەر لە چوار سەدەیەك لە بارەی جەستە و نەفسەوە دەیژەند.

من: ئەمە وروژاندنێكی فەلسەفیی بابەتەكەیە، لە راستیدا فەلسەفە جیابوونەوەی تێڕامانی زانستییە لە تێڕامانی ئەفسانەیی، ئەگەر سەیری یەكەمین قوتابخانەی فەلسەفە بكەین «فەلسەفەی ئایۆنی» لە پێشەوەیاندا «تالیس» پێداگریی لەوە دەكات هەموو شتەكان لە «ئاو»ەوە سەرچاوەیان گرتووە، تەنانەت خودی زەویش

دەفرێکە لەسەر ئاو راوەستاوە، گرنگێتی ئەم تێزە لەوەدا نییە سەرکەوتنێکی زانستی بەدەستهێناوە، بەڵکو ئەمە یەکەمین هەوڵێکە بۆ شرۆڤەی بوون و گەردوون لە دەرەوەی جیهانبینییە میتۆلۆژییەکان، یەکەمین هەوڵە سروشت بە سروشت راڤە بکات، بەهای بیرۆکەکە لێرەدایە نەك چەندێك زانستی نوێ پەسەندی دەکات. دەمەوێت ئەوە بڵێم فەلسەفە وەگەڕخستنی فەنتازیا نییە، ئەوەشی پەیوەندیی بە ناوەڕۆکی باسەکەوە هەبێت، بە دیدی خۆم گەردوون و خودی مرۆڤ بوونێکی ماتەریان هەیە، ئەمە هەمان روانگەی «هۆبز»ە کە من لێرەدا جەختی لەسەر دەکەمەوە، هەروەك د.ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام لە روونکردنەوەی ئەم کۆنسێپتە «هۆبز»ییەدا پێداگریی لەسەر ئەوە دەکات: شتێك بە ناوی دەروون یان رۆح، واتە شتێك لە خۆیدا ماددە نەبێت یان گەوهەرێکی ماددیی نەبێت، هیچ ئاسەوارێکی نییە. بۆ جەستە و دەروونیش هەمان شتە هەر راستە، دەروون و گیان شتێك نین لە دەرەوەی ماددە، جەستەی مرۆڤیش پێدراوێکی ماتەرییە.

خۆم: ئەمە لە کەمکردنەوەی شکۆی مرۆڤ نییە کاتێك تۆ مرۆڤ بە پێدراوێکی ماددیی پێناسە دەکەیت؟. بەم پێیە بێت هەمان ئەو تێزە کلاسیکییە ماتەرییە راستە کە دەیانووت مرۆڤ چییە جگە لە دوو تەڵ بزمار و سێ سەلك سابوون!!. بە راستی ئێمە تەنیا رووداوێکی بایۆلۆژیین یان شتێکی تر.؟.

من: نەخێر بابەتەکە لێدان نییە لە شکۆی مرۆڤ، بەڵکو

خۆناسینە، گەڕانە بەدوای بەرسڤی ئەو پرسیارە هەمەکی و هەمیشەییەی مرۆڤ لە خودی خۆی دەکات: من چیم؟. کرۆنۆلۆژیای مرۆڤ لەسەر زەوی و لە ژیاندا گەڕان بووە بە دوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا. مرۆڤی پێشین نەیویستوە بڕوا بەوە بهێنێت لەناوچوونی فیزیکیی خۆی کۆتاییە، نەیتوانیوە ئەوەش قبوڵ بکات ئافرێندراوێکی پیرۆز و تایبەت نییە، بەڵام فەلسەفە و زانست ئەو نەرگسییەتەی مرۆڤیان بەتاڵ کردەوە، یەکەمین جار شۆڕشی کۆپەرنیکۆسیی ئەم خودئەڤینییەی مرۆی تێکشکاند بە سەلماندنی ئەوەی زەوی نەك چەقی گەردوون نییە، بەڵکو هەسارەیەکی بچووکی شێوە هێلکەییە. دووەم لێدان تیۆری پەرەسەندن بوو کە لە لوتکەدا داروین وەستاوە، ئەم بیرۆکەیە ئەوەی سەلماند مرۆڤ بەرئەنجامی پەرەسەندنی بایۆلۆژییە نەك ئەو ئافرێندراوە پیرۆز و ئایدیاڵییە بێت ئاین و ئەفسانەکان لە مرۆڤیان گەیاندبوو. سێهەم زام زامی فرۆیدییە، سوژەی فرۆیدیی برینێکی قوڵی لە نەرگسییەتی مرۆڤدا دروستکرد، بەوەی لە رووی دەروونییەوە مرۆڤی دابەشکرد بەسەر سێ کارەکتەردا «من Ego، ئەو id، منی باڵا super Ego». بۆ ئەوەشی بەسەرماندا تێنەپەڕێت ناڵێین مادام مرۆڤ بوونێکی ماتەریی هەیە، شیاوی ژیان نییە، نا مرۆڤ لە هەموو بوونەوەرانی تر زیاتر ژیانە، چوونکە تاکە بوونەوەرە لە ژیان تێدەگات.

خۆم: ئەوەی هەمیشە ئێستم پێ دەگرێت ئەوەیە هێشتاش زانست و فەلسەفە نەیتوانیوە، مرۆڤێکی نوێ

بەرهەم بهێنێت، ئەو باوەڕە ئاینییە میتۆلۆژییە تێپەڕێنێت پێیوایە جەستەی ژن پاشکۆی جەستەی پیاوە، بەو پێیەی لە کتێبی پیرۆزدا «پەیمانی کۆن» لە «سفری تەکوین»دا باس لەوە کراوە، دایکە حەوا «یەکەم ژن» لە پەراسووە گێڕەکەی بابە ئادەم «یەکەم مرۆڤ» ئافرێندراوە. هێشتا ئەم دیدە ئەفسانییە بەشێوەیەکی تر و لە قاڵبێکی نوێتردا مێشکی مرۆڤ سەبارەت بە بوونی ژن و جەستەی مێینە ئاراستە دەکات. کەواتە سوودی فەلسەفە و زانست چییە کە نەتوانێت ئەو باوەڕە ئەفسانەییە تێپەڕێنێت لە کاتێکدا مرۆڤایەتی هاوچەرخ جاڕی پیادەکردنی سوپەر عەقڵانییەت دەدات؟.

من: کێیە دەڵێت لەناو عەقڵی ئامێری و مۆدێرنێتەدا جێگەی خورافات نابێتەوە؟. هەندێك لە ئەنترۆپۆلۆژیستەکان مێژووی مرۆڤایەتی بەسەر سێ قۆناغدا دابەش دەکەن «قۆناغی جادوو، قۆناغی ئاین، قۆناغی زانست». هەردوو قۆناغەکەی سەرەتا لەسەر بنەمای خورافات و میتۆلۆژیا وەستاون، بەڵام ئایا ئێمە ئێستا کە لەناو قۆناغی زانستداین جێگەیەك نەماوە بۆ ئەفسانە؟ ئایا مودێرنە جیا لە ئەفسانە نوێیەکان، توانیویەتی ئەو رۆحە خورافییەی مرۆڤ بکوژێت؟ باوەڕم وایە توخمی هەرە سەرەکی لە پێکهاتنی نەتەوەکاندا ئەفسانەیە، کەواتە هێشتا ئامادەگی ئەو ئەندێشەیە لە ژیانی ئەمرۆماندا زیندووە، ئەم تێزەش بە روونی لای «یۆنگ» بەرجەستە بووە، کە بۆ ناسینەوەی تاك پەنا دەباتە بەر ئەم

میتۆلۆژییانەی نەست و نائاگاییەکەی پێکدەهێنن. ئەگەر سەیر بکەین «دایە ڕێزبار» لە ئاینی یارساندا خواوەندە، ئەمەش دیسان ناکاتە ئەوەی ئێمەی کورد ژن وەك ڕەگەزێکی یەکسان دەبینین، بە پێچەوانەوە ئەمە بەرزکردنەوەی ژنە بۆ سوپەر ژن یان بۆ ژنێکی ئایدیاڵی وەها کە خاوەنی جەستەی خۆی نییە، بۆیە لە هەر پەیوەندییەکی جەستەییدا ئاستی لە خواوەندەوە دادەبەزێت بۆ ئاستە «ئاژەڵییەکە»،!! لە دابەزینی ئەم لیڤڵەشدا ژن کە لە دیدی ئێمە بوونێکی بەرجەستەی نییە، دەگاتە رادەی قێزلێبوونەوە، نهێنی توندوتیژیی و کوشتنی ژنی کورد بەشێکی زۆری لێرەدا خۆی حەشارداوە. بە زمانێکی سادەتر ئێمە دایکی خۆمان وەك نموونەیەکی ئایدیاڵی و سوپەر دێتە بەرچاو، کە نموونەی پاکیزەییە، بەڵام ئەگەر هەست بکەین ئەم دایکە جگە لە باوکمان پەیوەندیی سێکسیی بە پیاوێکی ترەوە هەبووە، وێنا ئایدیاڵییەکەی وەك ئاوێنەیەك دەشکێت، لەم کاتەدا بەرگەی بوونە بەرجەستەکەی ناگرین و لە نزمترین ئاستی کاردانەوەدا بە نەفرەتی دەکەین.

خۆم: بابەتێکی هەستیارە، بیروباوەڕی ئاینیی و میتافیزیکیی جەستەی مرۆڤ وەك سروشتێکی ئاژەڵی چاو لێدەکات، ئەم ڕوانگەیە لە بواری فەلسەفیشدا ڕەنگدانەوەی زۆری هەبووە، بەتایبەت لای «ئەفلاتۆن» کە ئەو پێیوایە بەختەوەریی شتێکی ڕۆحییە و لەسەر ئەشکەنجەدانی جەستە ڕۆنراوە، هەمان شت لای سۆفیزمی ئیسلامی و تەوژمە جیهادییەکان بەرجەستە بووە، تەنانەت لە قورئاندا ئایەتێك هەیە لە

وەسفی بێباوەڕاندا دەڵێت «ئەوان وەکو ئاژەڵ وان، بەڵکو خراپتریش»! تاوانی ئەو بێباوەڕانەش ممارەسەی ئازادییەکانی جەستە بووە. لەم سیاقەشەوە باوەڕی ئاینی پرۆسەی سێکس وەك کردەیەکی ئاژەڵی دەبینێت، هەربۆیە دوای تەواوبوونی ئەو کردەیە پێویستمان بە کرداری خۆپاککردنەوە هەیە. ئەوەشی پێویستە ئاماژەی پێ بدەم، داروین و زانستەکان سەلماندیان مرۆڤ هەر رەگەزێکی تری ئاژەڵە، پێموابێ ئەرەستۆ بوو دەیووت «مرۆڤ ئاژەڵێکی قسەکەرە»، بەڵام لەوە زیاتریش مرۆڤ ئاژەڵێکی بیرکەرەوەیە. لە کاتی سێکسدا مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی راستەقینەی خۆی و ئەو هیومانیزمەی لەسەر سروشتە ئاژەڵییەکەی رۆنراوە.

من: مرۆڤ چۆن لە رێگەی جەستەوە هەست بە بوونی خۆی دەکات، هەر لە رێگەی جەستەشەوە خۆشەویستی ممارەسە دەکات، ئەوەی پێی دەوترێت پەیوەندیی رۆحی ئەبستراکت شتێکی پێکەنیناوییە، ئاخر تەنها خێوەکان کۆمەڵێك رۆحی نابەرجەستەن، دەکرێت بڵێین پەیوەندیی رۆحی دیاردە و پەیوەندیی نێوان خێوەکانە نەك مرۆڤەکان.

خۆم: جەستە زۆر گرنگە، بە تایبەت بۆ توخمی مێینە، ئەو جەستەیە نا بووەتە شتومەك و بزنسی پێوە دەکرێت، بەڵکو ئەو جەستە ئازادەی ماناکانی ژیانی لێوە هەڵدەقوڵێت. نووسەری فێمینیست «ژولیا کریستڤیا» پێداگریی لەسەر ئەوە دەکات ئەگەر ژن جگە لە جەستەی خۆی هیچی تریش بەدەستەوە نەبێت، دەتوانێت ئەو جەستەیە بکاتە میکانیزمی

بەرەنگاریی و ئازادیی خودی خۆی، چوونکە ئەگەر پیاوان بتوانن هەموو شتێکی ئەویتری ژن مۆنۆپۆل بکەن، ناتوانن جەستەی ئازادی ژنان داگیر بکەن، لەم کاتانەدا ئەوەی بەدەست ژنەوە ماوەتەوە جەستەی ئازادی خۆیەتی کە وەك باسمان کرد دەلالەتی بوونی خۆیشیەتی لە ژیاندا. هەر لەژێر کڵاورۆژنەی ئەم دیدگایەوە سەرلەبەر دژی پرۆسەی بە کاڵاکردنی جەستەی مێیەنم کە بەرهەمی سیستمی مەسرەفگەرایی کاپیتالیزمە، بە تایبەت لەناو ژنانیشدا وێنەی ژنێکی روخسار جوان و شیك پۆش و خاوەن جەستەی سەرنجڕاکێش وەك ژنێکی ئیدیاڵ زەق دەکرێتەوە، هەم لە بواری ڕیکلام و رشتەکانی تری بازرگانیدا، ئەمەش لە کتێبەکەی «نەوامی وۆڵف» بە ناوی «ئەفسانەکانی جوانی» بە روونی و چڕیی ورد کراوتەوە.

من: هەموو کۆکین شارستانێتی سەرمایەداریی ئەمڕۆ خۆشەویستی تێدا نییە»خۆشەویستی بە رەهەندە فراوانەکەی خۆیەوە»، رەنگە داکۆکیکردن لە خۆشەویستی، وەك داکۆکی لەو شەمەندەفەرانە بێتە بەرچاو بە خەڵوز دەبزوان، یان وەك مرۆڤێکی دابڕاو لە ژیانی هاوچەرخ تەماشا بکرێین، لە باشترین حاڵەتدا بەوە رازی دەبین وەك لایەنگری کەلەپورێکی دێرین ناوزەدمان بکەن. کێشەکە ئەوەیە مرۆڤی نوێ سەرقاڵی چێژی کاتییە، هەر بۆیە ژن وەك یەکێك لە سەرچاوەکانی چێژ سەیر دەکات، لە راستیدا هەموو پەیوەندییەکی خۆشەویستیی پەیوەندیی جەستەییە، بەڵام

مەرج نییە هەموو پەیوەندییەکی جەستەیی خۆشەویستی بێت. سەبارەت بەم پرسە من گومانم لە خودی زمانیشە «چ زارەکی، چ نوسراو» کە ئامێرێکی نێرسالارانەیە، تەنانەت رەخنەی من لە شیعری ئیرۆتیکی کوردیی ئەوەیە داوا لە ژنی کورد دەکات بە فۆرمێك ئارایشت و مامەڵە لەگەڵ روخساری خۆی بکات وەك لە کەناڵەکانی پۆرنۆدا دەبینرێت، بە پێی حەز و هەوەسی منی پیاو مامەڵە لەگەڵ لەشولاری خۆی بکات، داواکردنی فۆرمی فۆتۆ مۆدێل لە مێینەی کورد لە رێگەی تێکستی شیعرییەوە ئەنگیزەیەکی نێرسالاریی دەیجوڵێنێت، شیعر نابێت نێرسالارانە بێت، بەڵکو دەبێت مرۆڤسالارانە بێت. ئیلیەت وتەنی «شیعر دەتوانێت شۆڕشێك لە هەستیاریماندا بەرپا بکات». کەچی شیعری کوردیی یان توخنی ژن ناکەوێت یان بەشێوەی نێرسالارانە باسی جەستەی ژن دەکات، مێژووی ئەدەبی کوردیی هەر لە «نالی»یەوە تاکو ئێستا شەڕی جەستەی لەگەڵ ژن کردووە، ئەوەتا «نالی» لە رێی شیعرەوە «مەستوورەی ئەردەڵانی» رووت دەکاتەوە، لە رێی باسی جەستە و سێکسوالێتییەوە رووبەڕووی مەستورە دەبێتەوە، ئەم نەزعە نێرسالارییەش لە ناو چەندان پەرەگرافی رۆمانەکانی «بەختیار عەلی»دا بە زەقی رەنگیداوەتەوە.

خۆم: شیعری ئیرۆتیکی کوردیی داوا لە ژنی کورد دەکات وەك قەحپەیەك خۆی نمایش بکات، ئەمە کارەساتێکی ئەدەبی گەورەیە، لە کاتێکدا «پۆل ریکۆر» باوەڕی وابوو «ئەوەی شیعر دەیکات یارمەتی فەیلەسووف دەدات»!!.

بەو پێیەی «رزگارکردنی وشەکانی ناو زمان و فراوانکردنی سنووری دەلالەتەکانی لە ئەستۆی شاعیردایە». بەڵام پرسیارە سەختەکە ئەوەیە لەم شەوەزەنگەدا کێ مۆمەکەی باشلار هەڵدەکات تا تۆزێك ژووری تاریکی شیعرمان رووناك بێتەوە؟.

٢٠١٩-١-١٠

کاتژمێر: بیست و دوو و پەنجا خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

ئەڵمانیا- بیلەفێڵد

-١٦-

من: کێشەی ژیاری ئەمڕۆی مرۆڤایەتی ئەو ئاکارەیە سەرمایەدارێی بەرەوی پێدەدا ئەویش مۆدێلگەراییە، لە راستیدا مرۆڤی هاوچەرخ هیچی تر نییە جگە لە رۆبۆتێك لە ناو سیستمی مەسرەفگەرایی مۆدێلگەرادا. مرۆڤی هەنووکە بە دوای خۆشەویستیدا ناگەڕێت، بەڵکو بە دوای چێژێکی کورت ماوە را دەکات. لە ڕیشەوە چێژیش وەهمێکە یان بابڵێین کۆتاییەکی تراژیدیکە، چون مرۆڤ خوازیاری بەردەوامی لەززەتە، کەچی سروشتی چێژ کاتییە و پێچەوانەی ویستی مرۆڤە، کە خوازیارە زەمەنی چێژ درێژە بکێشێت، کاتێك ئەمە روو نادات، سپەیسێکی دەروونیمان تێدا دورست دەبێت، دڵتەنگی ئەو هێزە ئامادەیەیە وەك هەمیشە ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە. لە راستیشدا خودی ژیان زنجیرەیەك رووداوی ناخۆشی خەمبارە، هەرچەندە لەوە چاو قایمترین

دان بەوەدا بنێین ژیان مانایەکی نییە، بەڵام «شۆپنهاوەر» لە بەردەمماندا قووت دەبێتەوە و پێمان دەڵێت «ئێوە بە چەشنێکی خەفەتبارانە فریوتان خواردووە». ئەو داوامان لێ دەکات پێ لەو فاکتە بنێین ژیانمان بێ مانایە، ئەوسا دوای ئەو دانپێدانانە دەتوانین لە ژیان تێبگەین و واتای هەبوونی خۆمان بدۆزینەوە. لێرەوەیە کە هەردەم دەڵێم مرۆڤی هاوچەرخ مرۆڤێکی خەفەتبارە و کۆیلەی ئەو سیستمە فێڵبازەیە مۆدێلگەرایی هەرمێنی پێداوە.

خۆم: خۆشەویستی ئەو بەها مەزنەیە مۆدێرنێتە و بالابوونی دەسەلاتی تەکنۆلۆژیا فەرامۆشی کردووە و رۆژانەش لە پرۆسەی بە ئامێرکردنی مرۆڤدا هێواش هێواش لە ناوی دەبات، ئەمە باسکردن نییە لە خۆشەویستییەکی عیرفانی رۆژهەلاتی کە لە سۆفیزم و پاسیڤیزمدا خۆی مانیفێست کردووە، بەڵکو قسەیە لەو دژواریی و پارادۆکسەی سیستمی عەقڵیی و پراگماتیکی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان لە نێوان مرۆڤ و سروشتی مرۆییانەدا دروستیان کردووە، هەروەك کارڵ مارکس لە نامەکەیدا بۆ هاوسەری جەختی لێ دەکاتەوە خۆشەویستی ئەو وزەیەیە مرۆڤ وا لێدەکات دووبارە هەست بە خۆی بکات وەك مرۆڤێك، هەرچەند مارکس لەو نامەیەدا رەتیدەکاتەوە مەبەستی «عەشقی فویەرباخی» یان عەشق بۆ میتاپۆلیزم و پرۆلیتاریا بێت، بەڵکو بە روونی باس لە عەشق بۆ مەعشوق و بەدیاریکراویی بۆ هاوسەرەکەی دەکات. خۆشەویستی لەم چاخەدا لە هیچ

شوێنێك بە بەرجەستەیی نایبینین جگە لەوەی ناچارکراوین لە فیلمەکاندا تەماشای بکەین، ئەویش وێنایەکی هێندە ئیدیاڵی و یۆتۆپی بۆ داتاشراوە، تەنیا لە دوورەوە تامەزرۆیی بۆ دەخوازین.

من: جیاوازیی من لەگەڵ زۆرینەدا ئەوەیە، فریوم نەخواردووە بە بانگەشەکانی مۆدێرنێتە و سەرمایەداریی کە عەقڵی لە بەرزترین راددەدا وەگەڕخستووە، چون ئەو شانۆ تاریك و رەشەم لەبەرچاوە کە ژیانی هاوچەرخمانی لەسەر نمایش دەکرێت، ئەوە دەبینم بە درێژایی ملیۆنان ساڵ لە مێژووی مرۆڤ لەسەر زەوی، هیچ زەمەنێك نادۆزینەوە هێندەی ئەم دوو سەدەیە پڕ لە دڵڕەقی و وێرانکاریی، زانستخوازیی و وەگەڕخستنی عەقڵی ئەبستراکت جگە لە جەنگە گەورەکان و کوشتار و ماڵوێرانی بۆ ملیۆنان مرۆڤ و ملکەچ پێکردنی چەند ملیارد مرۆڤی دیکە بۆ سیستمی قازانجخوازیی ئەو کۆمپانیایانەی پارێزەری مۆدێرنێتەن، دەستیشی خستۆتە بینەقاقای سروشت و گەردوون، تەنانەت ئاژەڵەکانیش لەم بێ ویژدانییە بەدەر نەبوون، ئەو مرۆڤە ئایدیاڵەی خۆی بە خودای کەون دەزانێت سڵی لە قڕکردنی گیاندارانیش نەکردۆتەوە، تەنانەت دەیەوێت سروشت بخاتە ژێر رکێفی عەقڵی ئابووری خۆیەوە، هەموو شتێك لەم سیستمەدا بە فۆرمی بزنس و ئابووری بیری لێ دەکرێتەوە، تەنانەت نرخ خراوەتە سەر ئەو ئۆکسژینەی سروشت بۆ ژیانکردن پێی بەخشیوین. خۆشەویستی دژی

ئـەم دڵـڕەقـیـیـەیـە، شـارسـتـانـێـتی نـویێ لـەسـەر بـوغـزانـدنی خۆشـەویستی ڕۆنراوە.

خۆم: ئەوەمان باسکرد شارستانێتی لەسەر کۆنترۆڵکردن و کۆیـلـەکـردن راوەسـتـاوە، بـەڵام نـاکـرێـت ئێمە لایـەنـگـری زانسـت و عـەقڵانییەتیش نەبین، کێشـەکە لـەمـەدایـە نابێت ڕەخـنـەکـانی ئێمە لـە مۆدێرنێتە، بکەوێتە ناو بازنـەی سـۆز و خـەیاڵدانی کۆنسـەرڤاتیزمەوە، مەسـەلـەی ئێمە ئەوەیە ئەو سیسـتـمـە هـەرەسی هێـنـاوە لـەسـەر هـەڵاواردن بینا کـراوە، نابێت پەشیمان بین لە عـەقڵ، بەڵام ناشێت پشت بکەینە ئەو هەست و سۆزەی دەروونی هەر یەکێکمان پێکدەهێنێت، ناشێ خەسڵەتی مرۆییانە لە ئینسان زەوت بکرێت و بە تێکرا ڕۆڵی ئامێریان پێ بدرێت، دەکرێت ئەم هاوسەنگییە رابگیرێت، پێموایە مارکس هەموو فەلسەفەی خۆی لەمەدا چڕ کردەوە تاکو هاوسەنگی نێوان سروشتی مرۆیی و پێشکەوتنی عەقڵ و ئابووری بپارێزێت، هەر بۆیە هەمیشە مارکس لێرەیە تاکو ئەم ناهاوسەنگییە هەبێت. هەرچەند ئەمە جارێ تەنها خەونێکە، بەڵام ئایا خەون و خەیاڵ شتگەلێکن بتوانین دەستبەرداری بین؟.

مـن: نـا، بـە پـێـچـەوانـەوە، ئـەم مـرۆڤـە کـۆتـکـراو و کۆنترۆڵکراوەی وەك میشێل فوکۆ باسی دەکات کە مۆدێرنێتە بەرهەمی هێناوە، زۆرترین خەونی ئازادیی دەبینێت، ئەگەرچی لە کۆتاییدا عەقڵ و زانست گرەوی لە خەیاڵ بردەوە، بەڵام هیچ ڕێگەیەکی تر بۆ خـەڵك نـەمـاوەتـەوە جگـە لـە چالاکیی

خەیاڵکردن، تۆ دیقەت بدە، دکتۆر زەڕینکوب باس لەوە دەکات، چیرۆکی «بەباچوو»ی «مارگرێت میشێل» لە یەکەم ڕۆژی بڵاوبوونەوەیەدا پەنجا هەزار دانەی لێ فرۆشرا و لە ساڵێکدا ئەم ژمارەیە بەرز بۆتەوە بۆ یەك ملیۆن و نیو نوسخەی فرۆشراوا, ئەمە نیشانی دەدات خەڵکی ئەم سەدەیە تا چ ڕاددەیەك گرنگی بەو بەرهەمانە دەدەن لە چوارچێوەی چیرۆك و خەیاڵدان. هیچ کات ناتوانین دەست لە خەیاڵ و خەونەکانمان هەڵبگرین، ملیۆنەها ساڵ لە ڕێی خەیاڵەوە شرۆڤەی بوون و دنیامان کردووە، یەکەمین قوتابخانەی فەلسەفە چەند سەدە پێش زاین لە ئایۆنیا سەریهەڵداوە، یەکەمین کتێبی زانستیش لە ساڵی ٤٦٦ی پێش زایین لە ئەسینا دەرچووە کە کتێبێکی سایکلۆپیدیی بووە بە ناوی «لەبارەی سروشتەوە» لەلایەن «ئاناکساگۆراس»ەوە نوسراوە، ئەی پێش ئەوە چی؟. هەرچەند وەها تێبینی دەکرێت، لە سەردەمی عەقڵ و زانستدا چیدی مرۆڤ پێویستی بە خەیاڵ و خەون نەماوە، بەڵام ئەمە تێزێکی درۆزنانەیە، مرۆڤ تا کۆتایی پێویستی بە خەون و خەیاڵە.

خۆم: خەون لێرەدا ئەو خەونە نییە شەوان لە کاتی نووستندا دەیبینین، بەڵکو دەکرێت ئەم خەونە لە ڕەهەندی سیمۆلۆژییەوە پێناسە بکەین، بەو ویست و ئەندێشەی لە پێناوی دنیایەکی جوانتردا وەك بیرۆکە و ئایدیا مێشکی بەشێك لە ئێمەی داگیر کردووە، ئەم خەونە هەر ئەو ئابڕووەیە پاسکاڵ بە بیرکردنەوەی باش پێی ناساندووین.

وەك خۆم، رێگە بە خەیاڵم دەدەم قسە بکات نەك بە زارم، بوونەوەرێکم خەونی زۆر دەبینم، خەیاڵ دەکەم، زمان و بیرم لەناو خەیاڵدایە، زۆر بڕوام بە سیکۆچکەی زەردەشتییەت هەیە «بیری چاك، وتەی چاك، کرداری چاك»، تا بە باشی خەیاڵ و بیر نەکەینەوە، چاك نادوێین و چاوەڕوانی کرداری باشیشمان لێ ناکرێت. کردار لە پرۆسەکەدا سێهەم هەنگاوە. لێرەدا ناکەوینە ناو گێروگازی کۆژێتۆ دیکارتییەکەوە «من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم». بەڵکو کرۆکی قسەم لەسەر ئەوەیە ئەم جیهانە شێواوەی ئەمڕۆ پێویستی بە خەیاڵ و بیری باشە بۆ گۆڕینی، وەك شاعیرێکی کورد دەڵێت ئەم پرسە «بیری وردیشی دەوێت».

من: پێموانییە ئەو خەونانەشی کاتی نووستن دەیانبینین دابڕاو لە ژیانی ریالیتە. «ئادلەر»ی زانای دەروونزانی رای جیاوازی هەیە لە فرۆید لە بارەی خەونەوە. ئەو پێیوایە خەونبینین دیاردەیەکی مرۆییە و مرۆڤ بە دیار خەونەکانییەوە لە باری حەپەساویدا ماوەتەوە، زۆربەی خەڵك پێیان خۆشە خەونەکانیان شرۆڤە بکەن و دەخوازن بزانن خەونەکانیان بۆ کوێ هەڵیاندەگرێت و لە ژیانی ئاگاییدا پراکتیس دەبێت یان نا؟، هەمیشە بە دوای کردنەوەی ئەو کۆدانە وێڵە لە خەونەکانیدا بینیویەتی. ئادلەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە «خەون کەرەستەیەکە سۆز و هەست دەوروژێنێت» بۆیە پێداگریی لەوە دەکات: ئەو جیاوازییەی لە نێوان خەون و ژیانی ئاگاهانەی مرۆڤدا هەیە، جیاوازییەکی رەها نییە و لە دنیای

واقیعی دانەبڕاون. بۆیە مرۆڤ لە کاتی بینینی خەونیشدا لە کۆمیکەیشنێکی پتەو و بەردەوامدایە لەگەڵ جیهانی دەرەوەی خەون یان با بڵێین لەگەڵ ژیانی ریالیتە. ئەمە هەر ئەو پرنسیپەیە «یۆنگ» باسی دەکات کە خەون لە شوێنێکی نادیاری دەروونداییە و لە «شەوانی گەردوونیدا» دەکرێتەوە. لەم سۆنگەوە تەنانەت ئەو خەونانەشی لە کاتی نووستندا دەیانبینین گوزارشت لە واقیع دەکەن یان تامەزرۆییە بۆ واقیعێکی چاوەڕوانکراو.

خۆم: ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەسڵی مەسەلەکەمان، باسی خۆشەویستی بوو کە دەکرێت ئەو بەهایە بێت ئارامی بۆ دەروونی مرۆڤ بگەڕێنێتەوە یان ببێتە هۆکاری هاوسەنگیی ژیان. لێرەدا هەست بە زیادەڕەویی دەکەم لە پێداهەڵگوتنی خۆشەویستیدا، وەك ئەوەی «ئالان بادیۆ» لە کتێبی «ستایشی خۆشەویستی»دا تێیکەتووە، لەو باوەڕەدام ئێمە خەریکە دەکەوینە ناو چاڵە بادیۆییەکەوە، لە بری کەرەستەی بەرجەستە، کە بریتییە لە شۆڕش و بەرەنگاریی، بەدوای پێدراوێکی ئیدیاڵیدا وێڵین کە ناوی خۆشەویستییە، لەوە زیاتریش بە دەرمانی هەموو دەردانی دەزانین.

من: هەڵەتێگەیشتنێك هەیە، ئێمە هەموو کۆکین لەسەر ئەو پرنسیپەی جاك دریدا کە دەیووت دیموکراسی هیچ کات نابێتە جێگەی بڕوا. وەك خۆم باوەڕم بە دیموکراسی لیبرالی نییە، رەنگە لە قۆناغێکدا بۆ تەکاندان بە بارودۆخی کۆمەڵگەی کوردیی پشتگیرییم لە ئەڵتەرناتیڤی دیموکراسی

کردبێت، بەڵام دیموکراسی ئامانجی من نەبووە و نییە، کەواتە بۆ تێپەڕاندنی ئەم قۆناغە کە دەتوانم ناوی بنێم «کۆتایی دیموکراسی» نەك «کۆتایی مێژوو»، مرۆڤایەتی پێویستی بە سیستمێکی تر هەیە، دیماگۆگیانە نامەوێت بڵێم ئەو ئەڵتەرناتیڤە دەبێت کۆمۆنیزم بێت، بەڵکو دەبێت سیستمێك بێت لە توانایدا بێت گۆڕانکاریی رادیکاڵی دروست بکات، کەرەستەکانی چۆنن و چی دەبن، من پەیی پێ نابەم. تەنها ئەوەندە دەزانم ئەو شارستانییە دیموکراسییە لیبرالییەی هەنووکە خۆشەویستی تیا نییە، دەبێت جارێکی تر خۆشەویستی بگەڕێتەوە بۆ مرۆڤایەتی! ئەمەش چۆن و کەی و کێ بیکا؟، حاڵی حازر لەتوانستی عەقڵی و فیکریمدا نییە بەرسڤی ئەو پرسیارە زۆر ئاڵۆزکاوە بدەمەوە.

خۆم: شەڕێکی گەورەت راگەیاند هەروەك ئەو شەڕە قورسەی نێوان «ئاموون و ئاتوون» بێ ئەوەی هیچ شەڕکەرێك لە گۆڕەپانەکەدا دیار بێت، دەرکەوتنی قارەمانانەی دیموکراسی لیبرالی وەهای لە «فوکۆیاما» کرد جاڕی کۆتایی مێژوو بدات، هەرچەند ئەم تێزە ئایدیالیستیانە خۆ دەنوێنێت، بەڵام کەوتنی «وۆڵ ستریت»یش نەیتوانی مانای «کۆتایی دیموکراسی» بگەیەنێت وەك تۆ بۆی چوویت!!. کەواتە ئەم گەشبینییە زیاد لەپێویستە لەبارەی کۆتایی دیموکراسی.

من: دیموکراسی لیبرالی یان سەرمایەداریی لە هەموو رووەکانەوە بەرەو خەرەند و هەڵدێر دەڕوات، لە رووی ئاکاریی و ئابوورییەوە لە گیانەڵادایە، ئەمە ئەو خۆشباوەڕییەی لینین

نییە لە سەرەتای سەدەی بیستدا کتێبێکی نوسی بەناوی «ئیمپریالیزم دوا قۆناغی سەرمایەدارییە»، بەڵکو روانینێکی قووڵە بۆ ئەو سیستەمە پیرەی مودێرنە هێنایە ئارا. ئەم سیستمە بەرگەی داهاتوو ناگرێت، رەنگە ژیانی ئێمە هێندە درێژ نەبێت، ئاڵوگۆڕەکان ببینین، بەڵام ناکرێت ئەم بڵقە وا بە ئاوسایی تا سەر بمێنێتەوە، رۆژێك هەر دەبێت بتەقێت. ئەگەرچی ئەم وشانەی زۆر ئیدیاڵ و ئاینیانە خۆ دەنوێنن، بەڵام وەك «برێخت» وتی «بێگومانم لە دۆزەخشیدا باخچەی رەنگاورەنگ هەیە». لەم دۆزەخەی مۆدێرنێتەدا خەیاڵ و ئەندێشەی رەنگاورەنگ هەر پەیدا دەبێت، تەکانێك بۆ پێشەوە بدات و مانا بداتەوە بە خۆشەویستی و بیگەڕێنێتەوە.

٢٠١٩-١-١٩

کاتژمێر: شانزە و سی و حەوت خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-١٧-

خۆم: ئێمە بۆچی خۆشەویستی دەکەین؟. ئەمە ئەو پرسیارە گرنگەیە هێشتا وەڵامێکی دڵنیاکەرەوەی پێ نەدراوەتەوە، زۆر جار کەڵکەڵەی ئەوە لە مێشکمدا دروست دەبێت، خۆشەویستیش وەك ئاین دروستکراوی دەستی مرۆڤ خۆیەتی بۆ ئەوەی خۆی رەها بکات، یان با بڵێین پاساوێك بێت پێی بژی و وەك ئامانجێك دەستنیشانی دەکات تاکو خەبات لە پێناویدا بکات. مرۆڤ هێندە خودپەرستە بڕوا ناکەم ئەوەندە خۆشەویستی لە دڵدا بێت، بتوانێت

بەشی کەسی تری لێ بدات، لە راستیدا ئەوەی پێی دەوترێت «خۆشەویستی خودا»ش جۆرێك لە بەرژەوەندیی و سات و سەودایە، هیچ مرۆیەك خودای خۆش ناوێت تاکو بەڵێنی پارادیسی پێنەدات! یان هەر هیچ نەبێت تاکو لە کاتی تەنگانەدا پەنای بۆ نەبات! ئەمە خۆشەویستی مەرجدارە، مرۆڤەکان لەنێو خۆیشیاندا هەر ئەو خۆشەویستییە مەرجدارە پیادە دەکەن، ئەگەر وا نەبوایە رووخساری زەوی و ژیانیش زۆر بەرەو باشی دەگۆڕا. باوەڕم بەوەیە خۆشەویستی جەنگانە، مرۆ چوونکە ژیانی خۆش دەوێت، لە پێناویدا بەرگەی ئازارەکانی ناوی دەگرێت، تەنانەت سەختترین جەنگی مرۆڤ جەنگی مانەوەیە لەژیاندا، وەك پەند باوەکە دەڵێت «ژیان ململانێیە لە پێناوی مانەوەدا». خەریکە بڕوا بەوە بهێنم ئینسان یەك تاکە شتی خۆش دەوێت ئەویش ژیانە، لە ژیانیشدا زۆرتر بیر لە خۆی دەکاتەوە.

من: نکۆڵی لەوە ناکرێت مرۆڤ بوونەوەرێکی ئەنانییە، بەڵام تا ژیانی خۆشتر بووێت دەتوانێت باشتر کەسانی تریشی خۆش بووێت، بە مانایەکی تر خۆشەویستی ئامرازێکە خودپەرستی مرۆ کەمتر دەکاتەوە، بەڵام ناتوانین جارێ ئەوە بدەین خۆشەویستی خودپەرستی لەناو دەبات، لە باری واقیعیشەوە ئێمە ناتوانین فێری خۆشەویستی بین و بیبەخشین، تاوەکو لە پێشتردا خودی خۆمان خۆش نەوێت، فەیلەسووفی دانیمارکی «کیەکیگارد» فێرمان دەکات خۆشەویستی زیاتر بوارێکی کرداریە نەك هەستەکی، بەو

پێیەی خۆشەویستی وامان لێدەکات خۆمان بە ژیانەوە ببەستینەوە، هەوڵ دەدەین لە روانگەی ژیاندۆستییە بیر لە هەموو شتەکان بکەینەوە، کەواتە ناکۆکی نییە لە نێوان خۆشەویستی ژیان و خۆشەویستی بۆ خەڵك، یان کەسێکی دیاریکراو، چون لە دوا وێستگەدا هەموو لە ژێر سایەی ژیاندۆستییەوە کۆ دەبنەوە، ئەمە ئەو وزەیەیە بۆ ئەمرۆی مرۆڤایەتی زۆر پێویستە، هەروەك فوکۆ جارێك وتی «ژیاری ئێمە ئیرۆتیکای تێدا نییە». فوکۆ باس لە شارستانی سەرمایەداریی هاوچەرخ دەکات، مرۆڤی داڕنیوە لە ماکی خۆی، ئەگەرنا ئینسان بەپێی سروشتە ئاژەڵییەکەشی بێت توانای ممارەسەی خۆشەویستی هەیە، بەڵکو خۆشەویستی دیاردەیەکی مرۆییە و پێویستە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە بۆ شانۆی ژیان، کە خەریکە ئەو تێبینییەی «هایدگەر»ی بیر دەچێتەوە: خۆشەویستی نوێنەرایەتی قووڵایی بوونی ئێمە دەکات و پێویستیشە هەر لەوێدا پارێزگاریی لێ بکرێت. دەبێت ئەوەش روون بکەمەوە، بانگەوازی پشتکردنە ژیان ناکەم بە رەتکردنەوەی شارستانێتی لیبرالی، بەڵکو هاوار بۆ جوانترکردنی ژیان دەکەم لە رێگەی گەڕانەوەی وزەی خۆشەویستی بۆ نێو شارستانێتی هاوچەرخ.

خۆم: باس هاتە سەر سورین کیەکیگارد، ئەو سەرسامی فەلسەفە ئایدیالیستییەکەی «هیگل» بوو، لە کۆتاییدا هەڵهێنجراوەکانی بوونە مامانی لەدایکبوونی ئیگزیستانسیالیزم، بۆچوونی ئەو لەمەڕ خۆشەویستی تاکو

ئەندازەیەکی زۆر جیاوازە، ئەو خۆشەویستی خودا بە بەرزترین و تاقانەترین جۆری خۆشەویستی پێناسە دەکات، تەنانەت بە رزگارکەری رۆحی خۆی دەیناسێنیت، لێرەدا ئیشکالیەتی من سەرهەڵدەدا خۆشەویستی خودا کە رێگەیەکە عارفەکان گرتویانەتە بەر لەسەر زەجرکێشان بینا کراوە، مرۆ چەند ئەشکەنجەی جەستەیی خۆی بدات، پشت بکاتە دنیا، لە باوەشی سرووتە رۆحانییەکاندا بنوێت، چەند زاهید بێت، دەگاتە خۆشبەختی و ئاسوودەگی دەروونی، هەروەك چۆن یەسوع لە پێناوی خۆشەویستی خودادا دەبێت لە خاچ بدرێت!!. ئەمە ئەو شتە پێچەوانەیەیە بۆ یەکێکی وەك من جێی سڵەمینەوەیە، دەبێت خۆشەویستی فێرمان بکات ژیانمان خۆش بوێت نەك دڕدۆنگمان بکات بەرامبەری.

من: ناتوانم خۆشەویستی خودا رەت بکەمەوە، ئەگەرچی من خودایەکی میتافیزیکیم نییە بەشێوەی رۆحی خۆشم بوێت، ژیان بەدیهێنەری منە، لەناو ئاڵوگۆڕەکانی گەردووندا دروست بووم، بەم هۆیە ژیان و گەردوونم خۆش دەوێت، بۆیە هەوڵی پارێزگاریکردنیان بە ئەرکی خۆم دەزانم. قسەی من لەسەر خۆشەویستییە لەسەر زەوی نەك لە ئاسمان، هیچ گریمانەش ناکەم جگە لە مرۆڤ هیچ بوونەوەرێکی تر هەبێت خۆشەویستی بکات، ئەگەریش هەبێت من نازانم ئەدگاری خۆشەویستی چۆنە لەلایان. لە راستیدا ئەوەی دەیزانم ئێمە مەحکومین بە خۆشەویستی، با خۆشەویستی زمانی ئەم چاخەش نەبێت، ئەمە مانای وانییە دەتوانین

دەستبەرداری بین، بەڵکو گەوهەرێکە هەر دەبێت لە کۆتاییدا بۆی بگەڕێینەوە، وەك «ئۆشۆ» لە خۆشەویستی ناڕوانم، تاکوو وەك دیاردەیەکی ئەبستراکتی رۆحی وەریبگرم، ئەم عیرفانە ناکۆکە لەگەڵ ژیاندۆستی، بە پێچەوانەوە «پاڵنەرە بایۆلۆژییەکان» و ئەو چەمکەی ئەو بەهەڵە ناوی بە «شەهوەتبازیی» دەزڕێنێت، بۆ من گرنگە، خۆشەویستی پەیوەندیی بەهێزی بەمێشکەوە هەیە، مێشکی پادشای لەشە و هەموو فەرمانەکان لەوێوە دەردەکرێن، بۆیە ئەو مێشکەی زۆر جار بە مەجازیی پێی دەوترێت «دڵ» چۆن فەرمان دەدات بەخۆشەویستی، بۆی هەیە فەرمانیش بدات بە تێکەڵبوونی بایۆلۆژیی نێوان دوو جەستە، هێشتنەوەی سپەیس لە نێوان جەستەکاندا و هێشتنەوەی خۆشەویستی وەك دیاردەیەکی سۆفیگەرانە ئەتککردنی خۆشەویستییە.

خۆم: ئەی ئەوە نییە «ئۆشۆ» بە پێغەمبەری خۆشەویستی ناوزەد دەکرێت؟. کەواتە خۆشەویستییە تایبەتمەندەکەی ئەو لە کوێدا هەڵەیە؟. ئەمە بابەتێکی هەستیارە و پێویستی بەروونکردنەوەی زۆرترە.

من: ئۆشۆ لە یەکێك لە کتێبەکانیدا باس لە ئەزموونی خەڵوەتکێشانی خۆی دەکات لە کەژ و چیاکاندا و رستەیەکی قەڵب دەنووسێت بەوەی سەرنجی هەر گیاندارێکی دابێت هەمیشە بە غەمگینییەوە جووت بوون نەك بە شادومانییەوە وەك ئەوەی فشارێکی نادیاری دەرەکییان لەسەر بووبێت،!. ئەو ناتوانێت بڕوا بەوە بکات ئەو پاڵنەرە خۆشەویستییە، ئەو

کە سەرسامە بە «جبران خەلیل جبران» باس لەوە دەکات نابێت خۆشەویستی ببێتە هەوەس، هەموو لەمەدا هاوڕاین، بەڵام ناکرێت خۆشەویستی لە یەکتر دوورمان بخاتەوە، تەنیا لە رێگەی رۆحەوە کۆمیکاسیۆن بگرین، ئەمە هەڵەیەکە من بە شکستی میتۆدلۆژیی لێکدانەوەی بۆ دەکەم، ئەو خۆشەویستییەی دەتوانێت من رازی بکات، دووباڵی هەیە، باڵێك توانەوەی رۆحییە «رۆح بە مانا ئاینییە باوەکەی نا»، باڵەکەی تریش پێککەیشتنی جەستەییە. هەروەك بۆ منیش کاتی زۆری ویست تاکو رای خۆم لەو روانگە عیرفانە ئۆشۆییەوە بگۆرم بۆ ئەم رایەی ئێستام.

خۆم: باوەڕم وایە مرۆڤایەتی وەك «ئیندەر ڤیگین»ی پاڵەوانی رۆمانی «یاری ئیندێرز» دوای ماندوبوون لە دڵڕەقی و راهێنان لەناو فەزایەکی بێ هەستدا وەك شەرکەرێك، ناچارین بگەرێینەوە بۆ خۆشەویستی، چون ئەو پاڵەوانە بەدەر لەوەی لە قوتابخانەیەکی جەنگیدا راهێنانی شەڕکردنی پێکرا لەسەر ئەگەری هێرشی بوونەوەرە ئاسمانییەکان، بەڵام هیچ کات دەستبەرداری خۆشەویستی نەبوو، وەك ئەوەی مرۆڤ لە کۆتاییدا تەنیا بەهایەکی جوان بۆی بگەرێتەوە خۆشەویستی بێت. مرۆڤ هەر دەبێت بە چەکی عەشق رووبەڕووی ناهەمواریەکانی نێو ژیان ببێتەوە.

من: لە نامەیەکی کۆندا نزیکەی بیست ساڵێك لەمەوبەر ئەمە دێڕانەم بۆ یەکێك لە هاوڕێکانم نوسیبوو: «ژیان زۆر لەوە تەنگەبەرتر بوو لەوەی من و تۆ تێیگەیشتبووین، شتێك

واتا بدات بە ژیان خەباتکردنە دژی ئەو جاڵجاڵۆکانەی تەونی پۆڵاین بە دەوری ویستە ئینسانییەکانمدا دەکێشن، لە پەنا ئەمەشدا خۆشەویستی گەوهەرێکی بەنرخە. لای من مرۆڤ تەواو ئەو کەسەیە خەباتگێڕێکی دڵ و دەروون پڕ لە خۆشەویستی بێت. ئاخر ئێمە لە ژیاندا مەحکومین بە بەرەنگاریی و خۆشەویستی. ئەوەی ئەم دوو شتە فەرامۆش بکات باشتر بوو لە دایك نەبووبا، ئێمە لە دایك دەبین بۆ گۆڕینی دنیا و خۆشەویستی یەکتر». لە بەشی کۆتایی نامەکەشدا نوسیبووم «لە عەشقدا هیچ یاسایەك نییە». ئەمەش پرنسیپێکە لە نەریتی جەنگەوە وەرگیراوە، چوونکە جەنگیش هیچ یاسایەکی نییە، کەواتە عەشق تێپەڕینە بەناو هەموو ڕێسا کۆمەڵایەتی و ئاینییەکاندا، خۆشەویستی شۆڕشێکی رادیکاڵە، شۆڕشگێڕی بە جەرگی دەوێت ببێتە ئاڵاهەڵگری ئەم شۆڕشە». گەرچی ئەم دێڕانە رەنگدانەوەی دنیابینی گەنجێکی ئەو زەمەنەن، بەڵام لە رووی ناوەڕۆکەوە هێشتا لەسەر بیروباوەڕی خۆم سوورم، پێموایە خەتەرناکترین کەسەکانی ئەم جیهانەن یاسا بۆ خۆشەویستی دادەنێن. خۆشەویستی خۆی یاسایەکە دژ بە هەموو یاساکانی تر.

خۆم: عەشق شۆڕشە، ئەوە راستییە رووتەکەیە، وەکوو هەمیشە شۆڕشەکان ئازاکان رابەرایەتی دەکەن، ئەو شۆڕشەی کەسێکی وەك «ماکسیم گۆرکی» کە بە رۆمانێك «دایك» بیست ساڵ شۆڕشی ئۆکتۆبەری بردە پێشەوە، چۆك

پێدادەدا، گۆرکی ئەگەرچی نووسەرێکی خەباتگێڕ بوو، بەڵام لە جەنگی عەشقدا زۆر زەبوون بوو، بەتایبەت زەبوونییەکەی لەو نامەیەدا بە روونی دەبینرێت بۆ «ئۆلگا ئیڤانۆفا»ی خانمە شۆخ و شەنگی نوسیبوو، کاتێك لە دوا دێڕەکانیدا بۆی دەنووسێت «ساتێك سایەی عەشقت بەسەرمەوە نەما، خۆشی لە دڵی مندا نەما، ئیتر لە ئێستا پێم خۆش بێت یان نا رادەستی مەرگم بکە و خەمی من لە یاد بکە». لێ لە «پاولۆ کۆیلۆ»وە فێربووم «عەشق نە گەورەیە، نە بچووك، عەشق تەنها عەشقە» بەڵام پێموایە عەشق یارییەکی شاهانەیە، مرۆڤە گرگنەکان ناتوانن ئەمە گەمە ئاگرینە بکەن.

من: هەرچەند نامەوێت ئەزموونی خۆم لەگەڵ خۆشەویستی باس بکەم، چوونکە هەمیشە وەك شۆپنهاوەر ئەم رستە سانسکریتییەم بە گوێی یاردا چرپاندووە «من هەر تۆم Tat Tvam asi» بەڵام هەستم بە زیادەڕەویی کردووە لە درکاندنی ئەم رستەیەدا، چون کەسم نەبینی ئەوە قبوڵ بکات من ببم بەو، رەنگە ئەمەش پەیوەندیی بەوەوە هەبێت پیاوێکی سوریالیم و هەمیشە سەرم لە قۆزاخەی وەهمدا بووە، هەمیشەش زیادەڕەویم کردووە لە خەون بینیندا، ئێستا گۆڕی ئارەزووەکانی خۆم و هەستی عاشقانەی خۆم دەبینم، ئەوەی وەك بارێك لەسەر شانمە تابوتی عاتیفەکانمانە!!. بەدەر لە هەموو ئەو تێکشکانانە پێموایە خۆشەویستی رزگارمان دەکات، خۆشەویستی رزگارکەرە.

خۆم: جارێك بۆ یارم نوسی: ئەو کاتەی وا دادەنێیت

بێدەنگیت و زارت وشەیەکی پێدا نایەت، گوێم لە دەنگی بەرزی قسەکردنتە، تۆ دەتوانیت چەندان رۆژیش دەم دابخەیت و وشەیەکت لە زار نەیەتە دەر، کەچی زمانی جەستەت پێ کۆنترۆڵ ناکرێت، ئەو کاتانەی هیچ وشەیەکت پێ نییە بۆ وتن، هەموو شتێك دەبیستم لە رێگەی زمانی جەستەتەوە. پێموایە هەندێك جار جوانی خۆشەویستی لەوەدایە، هاوار نییە، بەڵکو بێدەنگییە، وشە نییە، بەڵکو مامەڵەیە. بۆیە قەت بیر لەوە ناکەمەوە زیادەڕەویم کردبێت لە خۆشەویستیدا، بەڵکو تا رۆبچم لە عەشقدا زیاتر بەختەوەری بەدەست دەهێنم. بۆم گرنگ نییە لە دەرەوەڕا چۆن لێم دەڕوانن و چی دەوترێت، گرنگ ئەوەیە خۆم ئەو بڕیارەم داوە، ناهێڵم کەس ببێتە مێشکم و لە جیاتی خۆم بیرم بۆ بکاتەوە. ئەی ئەوە نییە مەشخەڵی عەشقێکم بەدەستەوەیە مەزنی پێ بەخشیوم؟ مەگەر من لەمە زیاتر چیم دەوێت؟.

٢٠١٩-٢-٨

کاتژمێر: نۆزدە و بیست و شەش خولەکی شەو

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

-١٨-

من: رەنگە ئەو بیروبۆچوونە لەسەر من دروست ببێت، سێکس بە پێشمەرجی خۆشەویستی دەزانم، ئەمە خراپ حاڵیبوونە لە روانگەکانم، لە راستیدا تێماکە خۆی ئاڵۆزە، پێویستە کۆنسێپتەکان بە وردی شیتاڵ بکەین، ئەگەرنا تووشی بەدحاڵیبوون دەبین. خۆشەویستی گەورەترە لە

پەیوەندیی نێوان هەردوو رەگەز، کاتێك باسی خۆشەویستی دەکەین مەبەستمانە بە مانا فراوانەکەی لە بارەیەوە بدوێین، وەك ئەو بەهایەی لە شارستانێتی ماددییانەی هاوچەرخدا غەوارە کراوە، لە کاتێکدا ئەو دەتوانێت رۆحی ساتەوەختێکی بێ گیان بێت. لە کرۆکی مەبەست دوور ناکەومەوە و دێمە سەر باسی خۆشەویستی نێوان هەردوو رەگەزی مرۆڤایەتی، گوومانم لەوە نییە خۆشەویستی لە سێکس گەورەترە، چوونکە سێکس کردەیەکە بە تەنیا، بەڵام خۆشەویستی پرۆسەیەکی دوولایەنەیە، جیا لەمەش تەنیا بڕوام بە سێکسێکە لە نێوان خۆشەویستەکاندا پیادە بکرێت، لەوە بەدەر هیچ پەیوەندییەکی سێکسیی قبوڵ ناکەم «ئەمە دەکرێت پەیوەندیی بە فۆرمی بیرکردنەوەی تایبەتی خۆمەوە هەبێت و ناتوانم گشتاندنی بۆ بکەم»، زۆر جار بڕوا بە تێزی «ژاك لاکان» دەهێنم کە پێیوایە لە پرۆسەی خۆشەویستیدا «پەیوەندیی سێکسیی هەبوونی نییە». ئەمە رەتکردنەوەی سێکس نییە، بەقەدەر ئەوەی نیشاندانی گەورەیی خۆشەویستییە بەراوورد بە سێکس. هەروەك ئەوەی لە رۆمانی «خۆشەویستی لە زەمەنی کولێرا»ی گابریل گارسیا مارکیزدا، روو دەدات، بەوەی «فلۆرینتینۆ»ی پاڵەوانی سەرەکی رۆمانەکە دوای ئەوەی لەگەڵ ٦٢٢ ژندا سێکس دەکات، لە تەمەنی ٧٢ ساڵیدا بۆ لای «فێرمینا»ی خۆشەویستی تاقی لاوی خۆی دەگەڕێتەوە، ئەم گەڕانەوەیە هەموو شتێك نیشان نادات، بەڵکو تابلۆ هەقیقییەکە

لەو رستە سەرەتانییەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت «تائێستا بە پاکیزەیی خۆم بۆ تۆ هەڵگرتووە!». رستەکە جۆرێك لە گاڵتەجاڕیی پێوە دیارە، بەڵام «ژاك لاکان» بە وتەزایەکی گرنگ ئەم هاوکێشە هاوسەنگ دەکاتەوە، بەوەی دەڵێت «هەموو کەسێك لە پرۆسەی سێکسدا تا ئەندازەیەکی گەورە دەچێتەوە نێو خۆی».

خۆم: ئالان بادیو لە کتێبی «لە ستایشی خۆشەویستیدا» پێیوایە خۆشەویستی بریتییە لە بەشداریکردنی دوو کەسی جیاواز، بە واتایەکی تر خۆشەویستی یەکگرتنی دوو جمکی جیاوازە، ئەو لێرەدا نموونەی «رۆمیو و جولێت» وە بیرمان دێنێتەوە، لە هەمان کاتدا بڕوای بە «گەشەی خۆشەویستییە». هاوکات دژ بە چەمکی «توانەوە»یە وەك ئەو توانەوەیەی «نیتچە» لە خاتوونێکی وەك «ئەندریا سالۆمی» کە زۆرێکی نەمابوو لە تەمەنی بیست ساڵیدا لەپێناوی عەشقی ئەو خانمە چل ساڵەدا خۆی بکوژێت، یان بە پێچەوانەی «ئۆگەست کۆنت» لە تەمەنی کاملێدا عاشقی کچێکی ئۆرستۆکراتی نەخۆش دەبێت «کارولین»، ئەم عەشقە نەك کاریگەریی لەسەر کەسێتی ئەو فەیلەسووفە دادەنێت، بەڵکو ئەدگاری فەلسەفەکەشی لەگەڵدا دەگۆڕێت، ئەمە لە کاتێکدا وەك هاشم ساڵح، دەڵێت: کێ دەڵێت فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم دڵ و هەستی نییە؟ کێ دەڵێت هەموو فەلسەفەکە بریتییە لە ماددە و تەکنۆلۆژیا و میتۆدگەلە وشك و برینگەکان؟. ئایا ئەمە خیانەت نییە

لە ئۆگەست کۆنت خوێندنەوەمان بۆ بەشی یەکەمی فەلسەفەکەی هەبێت و بەشی دووەمی فەرامۆش بکەین؟. جیاواز لەمەش هیچ کات سێکس ڕەتناکەمەوە، مادام کردەی خۆشەویستی پرۆسەیەکی دوولایەنەیە، بەهەمان شێوەی سێکس، کەواتە خۆشەویستی و سێکس یەکتر تەواو دەکەن، نەك پێچەوانەی یەکتر بن. خەساندنی سێکسی ئیشی پیاوانی ئاین و رامیاریـیە. ئۆشۆ وتەنی «بۆ ئەوەی گایەك گالیسکە رابکێشێت پێشوەخت دەخەسێنرێت».

من: دەتوانم خۆشەویستی سەردەمی باڵادەستی لیبرالی ناو بنێم خۆشەویستی فاستفۆتی، یان گەڕان بە دوای چێژێکی خێرای سێکسیدا، مرۆڤی هاوچەرخ خۆشەویستی وەك تابلۆیەکی خەیاڵکرد دەبینێت، کات بە خێرایی ئەم مرۆیە دەبڕێت، دەبێت خێراتر لە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا هەنگاو بۆ ژیان بنێت، لە دیدی مرۆڤی نوێدا عەشق بابەتی ناو ئەفسانە دێرینەکانە، لە ژیاری هەنووکەی مرۆڤایەتیدا هەموو بەهاکان کاڵ بوونەتەوە، لەم ژیارە بێ هەستەدا هیچ کەس ئامادە نییە قوربانی بۆ عەشق بدات، بەڵکو هەموو بە دوای چەند لەحزەیەکی پڕ چێژدا دەگەڕێن لە کردەی خۆشەویستیدا، چێژ رێی لێنەگیراوە و رەوایی هەیە، بەڵام ناکرێت خۆشەویستی کورت بکرێتەوە بۆ پرۆسەیەکی میکانیکیی سێکسیی ئەبستراکت. ئەم چاخە چاخێکی کوێری رواڵەتپەرستە، تەنانەت دەستکاریی جوانی رووخساریش کراوە، لای من هەموو مرۆڤێك لە رووی سیماشەوە جوانی

خۆی هەیە، بەڵام شارستانێتی تەکنۆلۆژیی و سەرمایەداریی گرنگییەکی رادەبەدەر بەو جۆرە رواڵەتە دەدات کە دەکرێت بڵێین سیمایەکی هۆلیۆدییە، بۆیە حەزی پیاوان ئەوەی بەسەر ژناندا سەپاندووە بە کردەی ئارایشتی جوانکاریی هەستن، لە راستیدا نەشتەرگەریی جوانکاریی لە هەندێك حاڵەتی دەگمەندا نەبێت بریتییە لە مارکێتین بۆ لەشولار، ئەمەش ئاکارێکی ناپەسەندە سیستمی کاپیتالیزم بەرهەمی هێناوە. کارەساتەکە ئەوەیە هەموو پێناسەکانی «جوانی» لە رووخسار جوانیدا کورتکراونەتەوە، ئەمە پێچەوانەی ئەو گەوهەرەیە «ئەفلاتۆن» لەمەڕ «جوانی» دۆزیوەتییەوە بە تایبەت لە رێی «دیالۆگی سیمپۆسیۆن»ەوە، ئەوە روونکراوەتەوە چەمکی جوانی جگە لە خودی جوانی زۆر رەهەندی جۆراوجۆری تریشی هەیە کە ئەو بە چاکە و راستی دەیانناسێت، هەروەك چۆن لە زمانی گریکی کۆندا کالوس «جوانی» هەر بەو مانایەی پێشەوە نەدەهات بەڵکو بە مانای چاکەش بەکاربراوە.

خۆم: هەر لەبەرئەمە بوو بۆدریار جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە «تەکنۆلۆژیا دژی مرۆڤە». تەنانەت بە وتەی «ئالان تۆرین» مۆدێرنێتە ژێدەری چەوساندنەوە و بەندکردن و سێنترالیزمی خۆرئاواییە، روونیشە ئەم سێنترالیزمە لۆگۆسییە، سێنترالیزمی نێرگەرایی سپی پێستی خۆرئاواییە و هەموو ئەوانیتر رەت دەکاتەوە، مۆدێرنێتە ناتوانێت فرە کولتووریی و فرە جێندەریی قبوڵ بکات، بەڵکو لەسەر چەسپاندنی بەهاکانی خۆی راوەستاوە، ئەو بەهایانەش

لیبرالیزمی کردۆتە ئاینێکی گەردوونی، هەروەك چۆن «فوکۆیاما» بە دارمانی شورەوی هێندە شاگەشگە ببوو وەك پێغەمبەرێك تێزە ئایدیالیستییەکەی خۆی خستەڕوو «کۆتایی مێژوو» کە لیبرالیزمی بە پایانی مێژووی گەشەی فیکری و دوا قۆناغی شارستانێتی مرۆڤایەتی پێ ناساندین، بەڵام گەورەترین کارەساتەکان لەناو ئەم کۆتایی مێژوودا روودەدەن، وا هزر دەکەمەوە خۆشەویستی هاوچەرخ کاڵایەکە لەسەر خواستی نێرینە، ژنیش خودی کاڵاکەیە، تاکو ئەم سێنترالیزمە نێرینەسالارە بەردەوام بێت، خۆشەویستی تەنیا بریتی دەبێت لە «سێکسیزم» کە ئەم کۆنسێپتە بۆ یەکەمین جار لەلایەن «پۆلین لی»ەوە بەکارهێنراوە لە ساڵی ١٩٦٥.

من: نموونەی ئیدیاڵی ژن بەپێی پێوەرەکانی ئەمڕۆ، ئەو ژنانەن لە رووی رووخسارەوە لاسایی کچانی فۆتۆ مۆدێل دەکەنەوە، لە هزرینی مندا پرسی فۆتۆ مۆدێل و شاجوانەکان بەشێکن لە پرۆسەی بەکاڵاکردنی ئەویتری مێینە، دروستکردنی جیاوازیی چینایەتییە لەنێوان خودی ئافرەتاندا. وەك پێشتریش وتم شارستانێتی ئەمڕۆمان شارستانی چێژی خێرایە و سیماپەرستی یەکێکە لە دیاردە هەرە زەقەکانی، ئەوە راستە لە کۆنەوە تا ئێستا جوانی رووخسار لای هەردوو رەگەز گرنگی خۆی هەبووە، بەڵام هیچ زەمەنێك وەك ئێستا بەم شێوە ترسناکە رووخسار نەخراوەتە پێش هەر شتێکەوە. «پاسکاڵ» جارێك نوسیبووی «ئەگەر کیلۆپاترا کەمێکی تر لوتی درێژ بوایە روخساری دنیا دەگۆڕا».

ئاخر کیلۆپاترا ژنێکی فەمفەتاڵ Famme fatale بوو، ئەم وشەیەش ڕیشەکەی لە زمانی فەڕەنسیدایە و بە واتای ژنانی وێرانکەر دێت. ئەم تایپە ژنە لە ڕێی بەکارهێنانی سیحری جوانی ڕووخسار و لەشولاریانەوە سەرنجی پیاوان بە لای خۆیاندا ڕادەکێشن، هەر ئەم فۆرمە لە ژنان ڕۆڵی بەرچاویان هەیە لە کاری سیخوڕیی و بەدەستهێنانی خەونەکانیان بە جادووی جوانییەکەیان، وەك چۆن کیلۆپاترا توانی لە ڕێی سەرنجڕاکێشانی دوو سەرکردەی ئیمپراتۆریای ڕۆمەوە گەورەترین تراژیدیا بخوڵقێنێت. شارستانی تازەش شارستانی ژنانی فەمفەتاڵە، تەنیا جوانییەکی بکوژ دەخوازێت.

خۆم: کارەساتەکە ئەوەیە هونەر و ئەدەبیش تاکو ئێستا لەم نەزعە نێرسالارانە دەرباز نەبووە، بۆ وێنا «ڕەجا نەقاش»ی نووسەری ڕادیکاڵی عەرەب لە ڕێی کتێبێکەوە بەناونیشانی «ئافرەتانی شکسپیر» لەوێدا بە ئارگۆمێنت ئەو فاکتە دەسەلمێنێت «ڕووخسار و سیمای ژن لە شانۆنامەکانی شکسپیردا شوێنێکی بەرچاویان هەیە». لە شیعری کوردیشدا وەك ژانرێکی ئەدەبی بەهێز لەناو کورددا، ژن دوو وێنای سەرەکی هەیە، یان ئەوەتا وێنایەکی سادیستانە و ئازاربەخشی هەیە، کە برۆی کەوانە و چاوی تیرە و لەنجەی خەنجەرە، یان ئەوەتا وێنایەکی سێکسیزمی هەیە کە مەمك و ئەندامانی تری لەشی بەشێوەی پۆرنۆگرافی دەهۆنرێتەوە، زۆرینەی شیعری کوردیی بەسەر ئەم دوو ئاڕاستەیەدا تەوزیف بوون، بە دەگمەن دەتوانین شیعرێك بدۆزینەوە بە

چەشنی دێڕە شیعرەکەی پۆل ئێلوار «من لەبەر خۆشویستن تۆم خۆشدەوێت» باس لە خۆشەویستی بکات، هەر شاعیرە و جۆرێك داواکاری سێکسیی هەیە، لەوە ترازێدیتر ئێستا شیعری ئیرۆتیکی کوردیی لەلایەن چەند کاکێکەوە نوێنەرایەتی دەکرێت خۆیان گرفتارن بە نەخۆشی «فتشیزم» ئەمەش نەخۆشییەکی دەروونییە و کەسی تووشبوو بە کەلوپەل و جلوبەرگی رەگەزی بەرامبەر دەوروژێت. ئەو هەموو شیعرە لە بارەی ستیان و جلی ژێرەوەی ژنان، بەڵگەی یاخیبوون و دژەباویی نییە، هێندەی بەڵگەی بوونی ژمارەیەك کەسایەتی سیکۆپاتە لە نێوەندی ئەدەبی کوردییدا.

من: لە راستیدا پەنجەمان خستە سەر برینێکی گەورە، ئەم نەخۆشییە بە تەنیا لە نێو نووسەرە پیاوەکاندا باو نییە، بەڵکو زۆرجار لەلای خودی نووسەرە مێینەکەش هەرمێنی پێ دەدرێت. زۆر شیعرم بینیوە لەلایەن ژنە شاعیرەکانەوە، وەك رچەشکێنی لێکدانەوەی بۆ کراوە، بەڵام هەمان داوای سێکسیزمە نێرسالارانەکەیە لە رەگەزی بەرامبەر. ئەوەش پێویستی بە شیعر نییە، بەڵکو ئەمە شەوە سوورەکانی خۆی هەیە. شیعر وەزیفەیەکی جیاوازی هەیە، شیعرێك لەسەر سێکسیزم رۆنرابێت هەر بۆ نەفرەتلێکردن دەست دەدات، لای من شیعر هەڵگری خەمە وجودییە قووڵەکانی مرۆڤە. وەك ئەزموونی خۆم بە پێچەوانەی «سوارە ئیلخانیزادە»وە فۆرمی شیعریی خۆم دارشتووە، ئەو لە چامەی «شار»دا ئارەزوویەکی نوستالیژیی هەیە لە گەڕانەوە بۆ گوندەکەی،

هەروەك ئەو مرۆڤە كوردەی ناتوانێت لە شارە جەنجاڵە پیشەسازییەكاندا بژی! تەنانەت بە پێچەوانەی «جەلال مەلەكشاه»ش كە ئەویش لە دێڕە شیعرێكدا دەڵێت «ئەڵێم ئەم شارە جێبێڵم سەفەر بكەم.. بڕۆم و خۆم لە عالەم دەربەدەر بكەم». شیعری من شیعری شارە، كتومت خەمی ئینسانی هاوچەرخە، كە ژیانێكی ئاڵۆزی هەیە لە شارە قەرەباڵغەكاندا. لێ لای ئێمە شار خەسڵەتێكی ماتماتیكی هەیە و بەندە بە رێژەی دانیشتوانەوە بێ رەچاوكردنی ستاندارەكانی شار، كەچی هەمیشە شیعرەكانم رەنگی شارنشینیان هەیە، گەرچی دەبوو رۆمان بنووسم، بەڵام هەمیشە هۆڵدەرلین لەبەرچاومە كاتێك دەیووت «لەكۆتاییدا شیعر دەمێنێتەوە». با زۆر دوور نەكەومەوە لە كرۆكی باسەكە، شیعری ئێمە لە دیدگاكانی فیودالیزمی تێنەپەڕاندووە، هەرچەند كاتێك بەر مۆدێرنە دەكەوێت دەبێتە شیعری هەوەسبازیی و سێكسیزم.

خۆم: نیتچە دەیووت «هەموو ئەو نووسینانەی لە بارەی خۆشەویستییەوە دەنووسرێن، نووسەرەكانیان بە خوێنی خۆیان نوسیوویانن». كەوابوو ئێمە هێشتا لە بارەی خۆشەویستییەوە هیچمان نەنوسیوە، لە كاتێكدا دەیان هەزار لاپەڕەمان بە ناوی ستایشی خۆشەویستییەوە رەش كردۆتەوە، ئەمە قەیرانێكی گەورەیە ئێمەی تێكەوتووین. جارێ دەبێت لە پێشنۆرەدا پێناسەی خۆشەویستی بكەینەوە، كەواتە خۆشەویستی چییە؟. رەنگە وەڵامەكەیمان لای «ئالان بادیۆ» دەست بكەوێت، وەختێك لە بەرسڤی پرسیارێكی

هاوشێوەدا دەڵێت «خۆشەویستی ئەزموونێکی بەردەوامی بونیادنانی شتێکە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا. ئەمەش زەمەنی خۆڕاگرتنی خۆشەویستییە». پرسیارە سەرەتانییەکە ئەمەیە: ئێمە دەمانەوێت چی بونیاد بنێین لەگەڵ کەسێکی تردا؟. ئەمە ئەو شتەیە لە ئێستادا ناتوانم وەڵامی بدەمەوە.

٢٠١٩-٢-١٤

کاتژمێر: شەش و چل و چوار خولەکی بەیانی

رۆژی ڤالانتاین «رۆژی قازانج و مارکێتین لە رێگەی فرۆشتنی گوڵەوە»

نەخۆشخانەی گوتەرەسلۆ میتە

-١٩-

مـن: دیـدی میتـافیزیکیی هەمیشـە جـەخـت لـەسـەر کـەماڵـبوونی هـەمـوو شـتـەکان دەکـاتـەوە، بـە تـایـبـەت لە ئافراندنی مرۆڤدا پێیوایە ئەم گەردوونە بێ پایانە خراوەتە بەردەست و خزمەتی، هەروەك لە قورئاندا پێداگری لەسەر ئـەوە دەکـرێـت مـرۆڤ «پـیـاو سـیـمبولی مـرۆڤـە» لـە باشترین شـێـوەدا دیـزایـن کـراوە و وەك نـوێـنـەری خـودا لـەسـەر زەوی دەژیەت. راستییە تۆقێنەرەکە ئەوەیە ئەم دیدە لەژێر رۆشنایی زانستدا بەدرۆ کەوتۆتەوە. یەکەمین پیاو بە فۆرمێکی زانستی ئـەم بـاوەڕە کۆنکرێتییـەی لـەق کـرد نیکۆلا کۆپەرنیکۆس «١٤٧٣-١٥٤٣» بـوو، ئـەم لـە کتێبی «لـەبـارەی جـولانـەوە ئاسمانییەکان»دا کە لە ساڵی مردنیدا بڵاوکراوەیەوە، ئەوەی سەلماند خۆر لەشوێنی خۆیدا جێگیرە، زەوی هەسارەیەکی

ناجێگیرە و لە سوڕانەوەی بەردەوامدایە بە دەوری خۆردا. ئەمە یەکەم شمشێر بوو لە خودئەڤینی مرۆڤ درا، بەو پێیەی ئەو باوەڕە تەمەن ملیۆنان ساڵەی ئاوەژوو کردەوە کە وا دەبینرا زەوی چەقی گەردوونە و خودا بە تایبەتی بۆ ژیانی مرۆڤ دروست و دیزاینی کردووە. پاشتر هەریەك لە زانای رەچەڵەکناس «چارلز داروین» و زانای دەروونزان «سیگمۆند فرۆید» زیاتر لە کۆپەرنیکۆس رۆشتن بەوەی نەك هەر جوگرافیای ژیانی مرۆڤ، بەڵکو ئەمان خودی مرۆڤیان خستە دەرەوەی ئەو خودئەڤینییەی ئەقڵی ئەفسانەیی و ئاینیی بۆ مرۆڤی خولقاندبوو. کەوابوو نووکە ئێمە دەمانەوێت بڵێین چی؟ ئەوەی گەرەکمە وەك هەڵهێنجانێك بیڵێم ئەمەیە: مرۆڤ کامڵ نییە، ئەنجامی پەرەسەندنە، هیچ کاتێك نە مرۆڤ خۆی و نە بەرهەمهێنراوەکانی عەقڵی، ناگەنە کەماڵ، مرۆڤ دەبێت لەوە تێبگات نە خودایەك ئافراندوویەتی و نە خودی خۆیشی خودایە. ئەو بوونەوەرێکە وەك هەموو بوونەوەرەکانی تر، جیاوازییەکە ئەوەیە مرۆڤ توانای بیرکردنەوەی هەیە.

خۆم: زانست سەلماندوویەتی ئەوەی پێی دەوترێت سیستمی گەردوونی هەرەمەکیانە دروست بووە، مرۆڤ نەك سەنتەری گەردوون و بوون نییە، بەڵکو زۆر کلۆڵانە ملکەچی یاساکانی گەردوونە، هەروەك پرۆفیسۆری فیزیازانی ئەمەریکی ڤیکتۆر ستێنگەر لە وتارێکی نوێدا جەختی لەسەر دەکاتەوە، ئەگەر مرۆڤ دروستکراوی هەڵبژێردراوی خودا

بوایە دەبوو گەردوون بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ژیانی ئەودا دیزاین بکرابایە. بۆیە ئەو بڕوای وایە ناکرێت بەم حاڵەوە لافی ئەوە لێ بدەین گەردوون و مرۆڤ هێزێکی تایبەتی باڵا ئافراندوونی. ئەمە ڕێك هەڵوەشاندنەوەی ئەو تێزەیە «ئیبن روشد» بە بەردەوامی جەختی لەسەر دەکردەوە، کە ئەو هارمۆنییەتەی لە نێوان سروشت و مرۆڤدا هەیە، کاری ڕێکەوت یان شانسێك نییە، ئەو پێیوایە ناکرێت ئەم هەموو گونجاوییە لە خۆڕا هاتبێتە بوون بەڵکو ئەمە بکەرێکی گەورە و خاوەن هێزێکی لەبن نەهاتووی لە پشتەوەیە، ئەویش خودایەکە لە دەرەوەی گەردوون یان لە شوێنێکی هەرە بەرزی گەردووندا نیشتەجێیە. زانست مرۆڤی رووت کردەوە لە هەموو شانازییەك، ئاوێنەیەکی داوەتە دەستی تا رووت و ڕەجاڵی خۆی ببینێت. هەر سەرەتاش مرۆڤ خۆی بە بچووکتر زانیوە لەو دیاردە گەورانەی لە ژیاندا بینیونی، بۆیە پەنای بردۆتە بەر داتاشینی وەهم و ئەفسانەی گەورە تاکو خۆی پێ ڕەها بکات، بە پێی پێناسەی «ئادلەر» هەموو کەسێکی نارسیستی گرێی دەروونی خۆبەکەمزانینی هەیە. لەم سۆنگەوە دەتوانین بڵێین هەموو روانگە میتافیزیکی و غەیبانییەکان کە مرۆڤ بە سەرداری جیهان دەبینن، لەو گرێی خۆ بەکەمزانینەوە هاتووە. هەنووکە دەزانین مرۆڤ نە سەنتەری گەردوونە، نە بوونەوەرێکی تایبەت و هەڵبژێردراو، ئەی چار چییە؟! لای من وایە جگە لە خۆشەویستی چارەیەکی تر لە بەردەم مرۆڤدا نییە، سیستەمی گەردوونی سیستمێکی

میکانیکی رەقە، ئەوەی پێی دەوترێت خۆشەویستی دیاردەیەکی مرۆییە، کەواتە خۆشەویستی هێزی مانەوە و بەردەوامی ئینسانە لەسەر زەوی.

من: ئەمە هەمان ئەو باوەڕەیە ئۆرفیستەکانی سەدەی شەشەمی پێش زاین بانگەشەیان بۆ دەکرد، بەوەی خۆشەویستی وزەیەکی خەلاق و پرۆسەیەکی کاریگەرە کە ئەو یەکبوونە بەدی دەهێنێت لەوەوپێشتر پەرتەوازە کرابوو، ئەوەش دەدۆزێتەوە لەوەوبەر ون کرابوو. لەگەڵ ئەمەشدا خۆشەویستی فێڵکردنە لە ژیان، یان راستتر وایە بڵێین داهێنراوێکە بۆ ئەوەی بتوانین بەهۆیەوە بەردەوام بین لەسەر زەوی، خۆشەویستی بەشێك نییە لە هێزی سروشتی و خۆڕسکی مرۆڤ وەك هەموو شتەکانی تر داهێنراوە، بەڵام لەناو هەموو داهێنراوەکانی تردا جوانترینیانە یان راستتر کاریگەرترینیانە، بەڵام ئەوەی لە ئێستادا دەردەکەوێت، مرۆڤ بیەوێت وەك چۆن دەستبەرداری شەمەندەفەری خەلوز و مەنجەنیق بووە، ئاوهاش دەستبەرداری خۆشەویستی بێت، هەرچەند خۆشەویستی بوونێکی ماتریاڵیانەی نییە، کەچی لەدیدی مرۆڤی هاوچەرخدا، وەك هەر شتومەکێکی تر لێی دەڕوانرێت، کۆن دەبێت و مۆدی نامێنێت. کارەساتەکە لێرەدا خۆی مەڵاس داوە، مرۆڤ بڕیاریداوە بە دڵڕەقی بەسەر گەردووندا زاڵ بێت، نەك بەهێزی خۆشەویستی. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە فۆرمێکی مەعنەویی مەرگی مرۆڤ دەگەیەنێت، هەروەك چۆن نیتچە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە تێزی «خوا مرد»ی

خستەڕوو، کاتی ئەوەیە «نیتچە»یەکی تر لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا جاڕی «مرۆڤ مرد» بدات.

خۆم: لێرەدا قەوسێکی بچووك دەکەمەوە بۆ بابەتی مەرگ و خۆشەویستی، دوالیزمی مەرگ و خۆشەویستی، کرۆکی قوتابخانەی رۆمانسیزمی پێکدەهێنا، پەیوەندیيەکی قووڵ لەنێوان مردن و عەشقدا بەدی دەکرێت لای رۆمانسییەکانی سەدەی نۆزدە. ئێمە باس لە خۆشەویستی دەکەین وەك ئەو وزەیەی ژیان دروست دەکات، هارمۆنییەتێك دەبەخشێت بە دووانەی مرۆڤ و ژیان، چۆن دەکرێت ئەو پەیوەندییە بەهێزە هەبێت لە نێوان خۆشەویستی و مەرگدا؟. ئەمە تێما و ئاریشەیەکی فەلسەفیی بووە هەر لە سوکراتەوە تاکو فەلسەفەی هاوچەرخ، هەمیشەش وا بیر لە فەلسەفە کراوەتەوە بریتییە لە فێربوونی چۆنێتی مردن، ئەمە ئەو تێزەیە میشێل دۆمونتین لە پلاتۆوە درێژەی پێداوە، دواتر ئەوەش دەخاتە روو «مردن بەشێکە لە دیسپلینی ژیان». هەروەك پێشتریش سوکرات جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە مردن کۆتایی نییە، بەڵکو سەرەتای سەفەرێکە بەرەو شوێنێکی تر. ئەگەر فەلسەفە لە پلاتۆوە زانینی چۆنێتی مردن بووبێت، لە مارکس بە دواوە دەبێتە فێربوونی چۆنێتی ژیان. رەنگە ئەو پەیوەندییە قووڵەی رۆمانسییەکان لە نێوان مردن و خۆشەویستیدا دەیانبینی پەیوەندیی بە هەژموونی ئەو دیدە فەلسەفییەوە بێت لە پێشەوە هێمامان بۆ کرد.

من: بابەتی مەرگ، جێی پرسیاری فەلسەفەیە، بەڵام

مەرگ شتێکە لەناو ژیاندا روودەدات، یان بەرئەنجامی ژیانە. هایدگەر پێیوایە مەرگ سیمایەکە لە سیماکانی ژیان، کە هەر خودی بوون لەناو خۆیدا هەڵیگرتووە. هەرچی «سورین کیەکیگارد»ە پێیوایە مردن دەلەلاتێکی ئەخلاقی هەیە و دیاردەیەکی گشتیی نییە، بەڵکو پەیوەستە بە تاکەکەسەوە، بەدیوێکی تردا لە دیدی ئەم فەیلەسووفەدا ئەو مرۆڤەی دان بەوەدا بنێت مردن دیاردەیەکی گشتییە و کەس لێی دەرباز نابێت، ئەمە تەنیا زانینێکی ئەبستراکتە، گرنگ ئەوەیە بزانێت مردن رووداوێکی پریڤاتە و بەروونی بڵێت «دەبێت منیش بمرم». کەچی لای سارتەر مەرگ هەروەك خودی ژیان رووداوێکی پووچە و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ناتوانێت لە بارەی مەرگەوە هەڵوێست نیشان بدات، چون مەرگیش بە چەشنی لە دایکبوون ئارەزوومەندانە نییە و لە دەرەوە بۆمان دێت. خاڵی ناوکۆیی خوێندنەوە و جیهانبینی فەلسەفە و فەیلەسووفەکان ئەمەیە مەرگ شتێکە پەیوەستە بە خودی ژیانەوە، بە مانایەکی تر مردن هێزێکە لەناو بووندا دەردەکەوێت، هەرچەند دیاردەیەکی گشتییە، بەڵام دەبێت مرۆڤ وەك رووداوێکی تایبەت لێی بڕوانێت، ئەوسا زاڵ دەبێت بەسەر ترس لە مردندا.

خۆم: هەروەك گلگامێش ئەم گوزارەیە دووپات دەکەمەوە «لە ژیان دەگەڕێم»، چاوم بڕیوەتە ژیان، رەنگە زۆر ترسم نەبێت لەوەی رۆژێك دەمرم، ناڵێم هەر ناترسم، چوونکە ترس رەهەندێکی غەریزی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا مردن

نامتۆقێنێت، لەبەرئەوەی هیچ کات مردنم لەبیر نەکردووە، بەپێچەوانەوە ئەوەم لەبەرچاو گرتووە پێش ئەوەی مەرگ بگاتە سەرم، ئەوەی دەمەوێت ئەنجامی بدەم و ئەو پەیامەی هەمە بیگەیەنم، کافکا وتەنی من پێش لە دایکبوون بە ملیارەها ساڵ مردبووم، ئێستاش بێ زیان لەو ژیانە دەردەچم و دەمرم. هەوڵمداوە لە مردن تێبگەم وەك دیاردەیەکی تایبەت نەك گشتیی بە ئامانجی تێگەیشتن لە ژیان و لە پێناوی چێژوەرگرتن لەو ماوەیەی بوون، ئاخر تاکوو لە مەرگ تێنەگەین، مومکین نییە بتوانین فێری هونەری ژیانکردن بین!. تاکو زۆرتریش بیر بکەمەوە و بخوێنمەوە زیاتر لە مردن نزیك دەبمەوە، چون پتر پووچێتییەکانی نێو ژیان کەشف دەکەم، تاچەندیش پووچێتی ژیان بناسم، ئەوەندە حەزی خۆکوشتن تێمدا گەورەتر دەبێت، خۆکوشتن هەمیشە بەرئەنجامی شڵەژانی دەروونی نییە، بەڵکو زۆرجار لە کەشێکی زۆر ئارامدا روو دەدات.

من: لەوانەیە فریای خۆکوشتنیش نەکەوم. رەنگە مەرگێکی چەشنی ئەرخەمیدس لە چارەم نوسرابێت. تۆ دەزانیت مەرگی ئەرخەمیدسی چییە؟ رێم بدە چیرۆکەکە بگێڕمەوە، ئەرخەمیدس زانای ئەندازە و ماتماتیکی یۆنانی بوو، کاتێك ژەنەراڵ مارسیلیۆس، سەربازێکی گەمژە و لاژك دەنێرێت بە شوێنیدا بیهێنێتە لای، وەختێك سەربازەکە بانگی دەکات ئەرخەمیدس هیچ وەڵامی ناداتەوە، بۆ جاری دووەم سەربازەکە بانگی دەکات کە ژەنەراڵ مارسیلیۆس ناردوویەتی

بە شوێنیدا، بەڵام ئەرخەمیدس ئەوەندە وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: لێمبگەڕێ با هاوکێشەکەم تەواو بکەم. جاری سێیەم سەربازەکە بانگی دەکاتەوە، بەڵام ئەو گوێی پێنادات. بۆیە سەربازی نەزان لە تووڕەبووندا شمشێرەکەی لە کێلان دەردەهێنێت و دەیکوژێت، بەم جۆرە تەرمی خوێناویی ئەرخەمیدس دەکەوێتە سەر هاوکێشە تەواو نەکراوەکەی. منیش لە دنیای عەشقدا رۆچووم و لەبارەیەوە دەنووسم تا رۆژێك مردن بێ بەزەییانە دەگاتە سەرم و هەموو شتێك بە تەواونەکراویی جێدەهێڵم، بەڵام ئەوەی لە دوای من جێدەمێنێت دۆزینەوەی هەندەسەی خۆشەویستییە لە زەمەنێکدا کە بە زەمەنی ئاوابوونی حکایەتە گەورەکانی عەشق دەناسرێتەوە. کەچی زۆر جار وەها مامەڵە لەگەڵ نووسینەکانم دەکەم، پاساوهێنانەوەن بۆ خۆکوشتن، زۆرجاری تریش دەڵێم نا ئەوە منم بەردەوام گۆرانی بۆ عەشق و ژیان دەچڕم.

خۆم: خۆکوشتن جۆرێکە لە بنبەست، یان بێزاربوون لە دووبارەبوونەوەی ئەزموون و رووداوەکان، تاقیکردنەوەی شتێکی نادیارە، کەس توانای ئەوەی نییە بزانێت دوای مەرگ چیتر هەیە! هەرچەند بڕوام بەوەیە هیچی تر نییە جگە لە عەدەم، بەڵام هێشتا ناتوانین لەو گریمانەیە خۆمان دەرباز بکەین شتێکی تر رەنگە هەبێت دوای مەرگ. بەهەرحاڵ من لە کاتی پرۆسەی خۆکوژیی هەر کەسێکدا بە دوای مۆتیف و فاکتۆرەکاندا ناگەڕێم، نامەوێ وەك سایکۆلۆژیستە

ئەكادیمییەكان رستێك هۆكاری دەروونی ریز بكەم، لای من كەسێتی خۆكوژ كەسێتییەكی شیزۆفرینی نییە، مەسەلەكە لە شیزۆفیرینیا قوولترە، بە باوەڕی «تێلمان جێنز» زیاتر شاعیران بەلای خۆكوشتندا دەچن!!. وەك دەڵێت «وەكو وابێ خۆكوشتن پیشەیەك بێت تەنیا بۆ نووسەر و شاعیران هاتبێت. هەڵبژاردنی مەرگ وەك دوا لاپەڕەی پەیامی ژیان، وەك كۆتاییەكی خۆش كە هونەرمەندان دروستی دەكەن، ئەو هونەرمەندانەی تاوەكو دێت نووسینەكانیان لەگەڵ ژیاندا دەدرەوشێتەوە». مرۆڤی خۆكوژ بێ دەسەڵات نییە، بەڵكو تا ئەندازەیەكی زۆر هۆشیارە بەوەی چ كارێك دەكات، یان گەیشتۆتە قۆناغێك ژیان و مەرگ یەك مانای هەیە لای، بۆیە هەوڵ دەدات ئەو سنوورە بسڕێتەوە، هەندێك جار ئەوانەی خۆكوژیی ئەنجام دەدەن وەك ئەوەی ئامادەكاریی بكەن بۆ ئاهەنگێك ماڵ و خۆیان دەڕازێننەوە وەك ئەوەی «دۆرۆپی هێل» ئاهەنگێكی گەورە بۆ دۆست و ناسیاوانی ساز دەكات یەك رۆژ پێش خوكوشتنی، یان وەك نووسەری ئەڵمانی «تادۆز درۆڵ» پێش كۆتایهێنان بە رۆمانەكەی «قۆشمەچی» خۆكوژیی ئەنجامدا، ئەوەی سەرنجڕاكێش بوو بۆ ئێمە نووسەری ناوبراو لە دواساتەكانی ژیانیدا و لەگەڵ ئامادەكاریی بۆ خۆكوشتن جلە فەرمییەكانی دەپۆشێت و چەپكێك گوڵ دەخاتە سەر بێتی خەوەكەی و وتارێكیش بۆ مەراسیمی پرسەكەی دەنووسێت. ئەمە ناكرێت بڵێین لە بارێكی دەروونی هەڵچوودا كراون، كەواتە دەبێت بۆچوونە

باوەکەمان بگۆڕین لە بارەی کەسێتی خۆکوژ.

من: لەگەڵ ئەوەی هیچ بەختەوەرییەك بۆ مرۆڤ لە ئارادا نییە، هەروەك «ئاگامبێن» بۆی چووە، شتێك بە ناوی بەختەوەریی لە ئارادا نییە، ئەوەی هەیە تەنیا وەهم و جادوویەکە و مرۆڤ خۆی پێ فریو دەدات، لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت ئێمە هان بدەین بۆ ژیان بە هەموو چەرمەسەرییەکانییەوە، نەك بۆ راکردن لە ژیان، لەم روانگەوە ئێمە پەسنی خۆکوژیی ناکەین، بەڵکو لە بارەیەوە دەدوێین. ئەوەی لە کۆتاییدا من پێی رازی دەبم، بریتییە لە خۆشەویستی نەك هیچ شتێکی تر. خۆشەویستی نەمرە و هەموو ئەوانەشی پرشنگی خۆشەویستی لە دەروونیاندا دەدرەوشێتەوە دەتوانن بۆ هەمیشە بژین و لە هەموو بەهارێکی ژیاندا بژێنەوە. وەك خۆشم لەبەرئەوەی مرۆڤێکی عاشقم، لە ئێستادا هەم و لە ئایندەشدا بوونم دەبێت.

٢٠١٩-٢-٢٠

کاتژمێر: هەشت و سی خولەکی بەیانی

نەخۆشخانەی گوتەرەسلۆ میتە

-٢٠-

خۆم: مارتین هایدگەر لە کتێبی «بوون و کات»دا لە دەرەوەی تیۆرەکانی ئەنترۆپۆلۆژیا، لە هەوڵێکی گەورەدایە بۆ ناساندنەوە و دۆزینەوەی خودی ژیان کە مرۆڤ بەهۆی سەرقاڵییەکانی ترییەوە لە بیری کردووە، هەڵبەتە ئەوی دەیەوێت هەقیقەتی «بوون»مان نیشاندان بدات، کە تێیدا

مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ هەقیقەت، هەر لەم روانگەوە زۆرێك ئەو فەیلەسووفە بە باوكی رۆحی فەلسەفەی وجودیەت دادەنێن، كۆششی هایدگەر بۆ ئەوەیە مرۆڤ لەگەڵ راستەقینە و بوون ئاشت بكاتەوە، رەنگە ئەمان هەمان ئەو گەوهەرە بێت سوكرات پێش بیست و پێنج سەدە وەك پەیامێكی باڵا پێی راگەیاندووین «پێش هەر شتێك خۆت بناسە». لەو باوەڕەدام سەرباری پێشكەوتنی زانست و لقی مرۆڤناسی، بەڵام هێشتا ئینسان پێویستی بە زیاتر خۆ كەشفكردنە، پێویستی بە ناسینی زۆرتری «بوون»ە.

من: لە راستیدا مرۆڤ ئایدێنتیتیيەكی ئاڵۆزی هەیە، هەر زۆر زوو فێر دەبێت جیهانی دەوروبەر بناسێت، بەڵام درەنگ لە شوناسی خۆی تێدەگات، ملیاران مرۆڤ لەم شانۆی هەبوونەدا مردوون و هەن خۆیان تەنیا وەك «ناو»ێك ناسیوە، هیچ كات نەگەیشتوونەتە راددەی ناسینی هەقیقەتی خود. ئەمە فینۆمینێكی روونە، ناسینی خود زۆر سەختترە لە ناسینی ئەو ژینگە و دەوروبەرەی تێیدا دەژین، گێلترین مرۆڤیش توانای ئەوەی هەیە بە ئەندازەیەك لە دنیا و ژیان بەپێی سیاقە مێژوویيەكی خۆی تێبگات، كەچی تێگەیشتن لە خود دیاردەیەكی تایبەتە بە زۆر ژیرەكان. تراژیدیاكەش لەوەدایە خۆناسین نامانگەیەنێتە بەختەوەری، بەڵكو بە رێگەیەكی پڕ ریسك و دڵەڕاوكێدا دەمانبات، لەبەرئەوەی وێنای بەختەوەری وێنایەیەكی سەرابیانەیە، هەروەك محەمەد شوكری دەڵێت «بەختەوەری وەك باڵندەیەكی

جوان لەبەردەم پەنجەرەکانمان دەنیشێتەوە، هەر لێی نزیك ببینەوە هەڵدەفڕێت».

خۆم: گەڕان بە دوای خۆشبەختییدا لەو دیمەنانە دەچن «بودا»یان هەژاند و لە کوڕە میرەوە کردیان بە دێوانە، هەروەك چۆن گەڕان بە دوای هەقیقەتدا، تەنیا ئەو هەقیقەتەمان چنگ دەخات، هەقیقەت لە هیچ کوێیەك نییە و لە هەموو شوێنێکیشە!. «میگێل دی ئونامونۆ»ی فەیلەسووفی وجودی ئیسپانی رستەیەکی جوان تەرح دەکات «ئاینی من ئەوەیە لە ژیاندا بە شوێن راستی و لە راستیشدا بە شوێن ژیاندا بگەڕێم». ژیان جوگرافیایەکە بۆ گەڕان بە دوای هەقیقەتی خوددا، ئەو خودەی خۆی دەدۆزێتەوە دەتوانێت ژیانیش لە نێوخۆیدا کەشف بکات. خۆناسین دیاردەیەکی نوشداریی نییە و بزانین جەستەی مرۆڤ لە پەنجا بلیۆن سێلە پێکهاتووە، ئەم زانینە تەنیا کەڵکی بۆ پزیشکە پسپۆرەکان هەیە، خۆناسین پرۆسەیەکی سەختی گەڕانە بەناو دیوی ناوەوەی خۆت و ئەو جیهانە ئاڵۆزەی لە مێشکی هەر یەکێکماندا بوونی هەیە. مرۆڤ لە ژیانیدا مەحکومە بە گەڕان بەدوای خۆیدا، ئەمەش ناوێکی ترە بۆ کردەی گەڕان بەدوای راستیدا.

من: دەکرێت لێرەدا ئەزموونی کەسی خۆم باس بکەم. سەرەتا بە دوای خۆمدا دەگەڕام، خۆمم لە هیچ جێگەیەك دەست نەکەوت! چون تەنیا بە دوای دۆزینەوەی سروشت و سایکۆلۆژیای خۆمەوە نەبووم، بەڵکو بە دوای راستییەکدا

وێڵ بووم لە هەمووان ون بووە. سەرەتا پێموابوو ئەو راستییە ئاینە ئەمە ئەو کاتە بوو قۆناغی مێردمنداڵیم دەگوزەراند!. دواتر بۆچوونم گۆڕا و رووم کردە بیری کۆمۆنیزم، لەو کاتەدا بەچڕی دەمخوێندەوە تاکو دڵنیایی بەدەست بهێنمم ئەو هەقیقەتە کۆمۆنیزمە، خۆم زۆر ماندوو کرد تاکو ئارگۆمێنت بدۆزمەوە بۆ سەلماندنی هەقیقەتەکانم، بەڵام لە یەکێك رۆژەکانی ساڵدا، دروست لە تاقی لاویمدا پەندێکی بەرازیلی رایچڵەکاندم «ئەوەی هیچ نازانێت گوومان لە هیچ ناکات»، سەرباری ئەوەی سەدان کتێبم خوێندبووەوە، خۆم پێ نەزان بوو، چوونکە گوومانم لە هیچ نەدەکرد بە تایبەت لە رووی ئایدۆلۆژییەوە!. تێگەیشتم لە کردەی خوێندنەوە و بیرکردنەوەدا هیچ کات بە دوای هەقیقەتدا نەدەگەڕام بەڵکو بەدوای سەلماندنی ئەوەوە بووم بیرکردنەوە و ئایدیاکەم خودی هەقیقەتە، ئەم جارە هەموو شتێکم بە گومان و لەناو رەوشێکی تەژی لە دڵەڕاوکێدا خوێندەوە و لەنێو نادڵنیاییدا بە قووڵی بیرم کردەوە، پاش ماوەیەك بینیم هەموو بڕوا کۆنکرێتی و هەقیقەتەکانم ئاوەژوو بوونەتەوە.

خۆم: هەرچیم کردبێت بریتی بووە لە گوومان، ئاخر گوومان شتێکە یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی بگەینە دڵنیایی. نابینایەکی وەك «تەها حوسێن» لە تێکڕای عەرەب بیناتربوو، ئەو بەدوو چاوی تارەوە و لە رێی گوومانکردن لە کۆی مێژووی ئەدەب و رۆشنبیری عەرەبی بەتایبەت ئەو دیاردەیەی بە شیعری جاهیلی دەناسرێت، توانی بگاتە زۆر

فاكتی گرنگی زانستی، كە رۆشنبیرانی پێش ئەو هیچ كات بەو ئاكامە نەگەیشتبوون. چاوەكانی من بەهۆی گوومانكردن لە توێكڵی رووداوەكان زۆر بیناترە لە دیتنی ئەو رۆشنبیرانەی بە ناوی نوێگەرییەوە خۆراكی كۆن و ئێكسپایەری رۆشنبیری دەرخــواردی خوێنەر دەدەن، شانازیی بەخۆمەوە ناكەم، بەڵام ئەوەی فۆرمۆڵەی دەكەم چەند راستییەكی خەیاڵی نین، هەروەك چۆن رۆشنبیرانی ئێمە بوونەوەری خەیاڵین و بەرهەمەكانیان لە خەیاڵی تاكەكەسی خۆیانەوە هەڵدەقوڵێت، نەك رۆشنبیرانێكی مەوسوعی بن، هەرچەندیش وەك دێرە شیعرەكەی بۆدلێر «یەكێكم لە پەڕاوێزخراوە مەزنەكان». بەكورتی ئەگەر مۆمێكیشم هەڵنەكردبێت بەشێك نیم لەو تاریكییە، هیچ نەبێت قریشكەیەكم لەشەوەزەنگدا.

من: ئەوانەی گوومان دەكەن و رۆشتن شانبەشانی مێگەل رەت دەكەنەوە، هەردەم مەحكومن بە تەنهایی، تەنهاییەك رەنگە لە گازی سیانید خنكێنەرتر بێت بۆ ژیان، بەڵام مامانی بیرە، مامانی تازەگەرییە. جارێك «یانیس ریتۆس» لە دێرە شیعرێكدا نوسیبووی «هیچ تەنهاییەك بچووك نییە». تەنهایی نووسەران تەنهاییەكی جەنجاڵە، پڕە لە رووداو و كارەسات، پڕە لە حكایەتی مەزن و بەسەرهاتی گەورە، زۆرێكیان بۆهیمیانە دەژین «دەستەواژەی بۆهیمی لە زمانی فەرەنسی وەرگیراوە و لە بنەچەدا بۆ ئەو قەرەجانە بەكاردەبرا لە ناوچەی بۆهیمی وڵاتی چیكەوە كۆچیان كردبوو». لەگەڵ ئەوەی لەناو پووچییەكی مەزندا ژیان

بەسەر دەبەن، کەچی دەتوانن دەلالەت و واتای گەورە بە ژیان ببەخشن، ئەمە هەر ئەو وشانەیە «سامۆیل بێکیت» لە رۆمانی «ناو لێنەنراوەکان»دا دەیدرکێنێت «ئەوەی دەدوێت -من-م، بێهودە حکایەت بۆ خۆم دەگێڕمەوە، هەست بە تینوێتی و سەرما ناکەم.. بوومەتە کۆمەڵێك وشە تەنانەت هەر لە وشە پێکهاتووم». نووسەران ئەوانەن بوونە وشە، جیهانێکی تر بە ئامرازی وشە دەخوڵقێنن، جیهانێك هیچی لەم جیهانە ریالیتییە ناچێت کە لەسەر نادادیی و خوێن و ئێسك و پروسکی مرۆڤ بیناکراوە.

خۆم: بێ پێچ و پەنا نووسەران نوێنەری ئیبلیسن نەك فریشتە. ئیبلیس یەکەمین یاخیگەری رەمزییە، نووسەران هەمیشە یاخین لە ئاین و خودا و دەسەڵات و زۆرینە، رەنگە لە روانگەی دەروونزانییەوە کەسێتی نووسەر زۆر سەنگین نەبێت، بەوەی رادەدەی خودئەڤینیان لە خەڵکی ئاسایی بەرزترە، لەگەڵ ئەوەش نووسەران دیزاینەری راستەقینەی ژیان و کۆمەڵگەکانن. ئەمە ئەو گەوهەرەیە وای لە فرۆید کرد بەرهەمی ئەدەبی و هونەریی بە زادەی دەمارگیریی دەروونی لە قەڵەم بدات، چون ئەوان دنیایەك دروست دەکەن سەر بە ئەزموونی بیرکردنەوەی تایبەتی خۆیانە، هەروەك ئەو منداڵەی بە میکانۆکانی شارێکی خەیاڵی و جیهانێکی ئەفسووناویی دروست دەکات، تەنیا لە مێشکی خۆیدا نەك لە ریالێتیدا. ئەم روانگەیە لە مەقولەیەکی گرنگی «ئیدگار کرێت»دا بە روونی بەرجەستە بووە، مینا نووسیوویەتی «نووسین وەك ژیان وایە لەناو

دنیایەکی تردا، جیهانی ئەو مرۆڤە بێشوومارانەی تۆ نین، بەڵام ڕێك خۆتن». نووسەران لە دوو دنیادا دەژین، دنیای واقیعی و دنیای ڕەمزیی ناو تێکستەکان. تەنانەت دۆزەخ و پارادیسی نووسەران هەر لەناو تێکست و بەرهەمەکانیاندایە. دەتوانم بڵێم نووسین پرۆسەی بەرهەمهێنانی واقیعە لە ڕێی خەیاڵەوە.

من: ئەوەی هانم دەدات بۆ نووسین، بەتەنیا خۆشەویستییە. خۆشەویستی بۆ ژیان، بۆ مرۆڤ بە گشتیی، بۆ ڕەگەزەکەی تر. بۆ ئەوەی لاپەڕەکیش بنووسم پێویستە پێش زیاتر لە دوو سەد تاکو پێنج سەد لاپەڕە بخوێنمەوە، جاری وا هەیە دوو سەد لاپەڕە دەخوێنمەوە ئینجا تەنها دوو وشە دەنووسم یان هەر هیچ. ترسێکی گەورەم لە نووسین هەیە، لە ڕەخنە زبر و بێویژدانەکان ترسێکم نییە، نا، من لەبەر هۆکارێکی تر تووشی تۆقین بووم، ئەویش ئەمەیە هێشتا شتێکم نەنووسیبێت کاریگەریی لە جیهانی واقیعیدا هەبێت و دەربکەوێت!. یان ئاستی نووسینی من لە خوار ئاستی زانیاریی و خواستی خوێنەرەوە بێت، بەم بۆنەوە دەخوێنمەوە، زۆریش دەخوێنمەوە، بەڵام کاتێك هەندێك کتێب و نووسین دەخوێنمەوە بە سەرسامییەوە لە خۆم ڕادەمێنم و دەڵێم چەند گەمژە بووم تازە ئەمانە فێر دەبم لە حاڵێکدا پێشتر پێمابووە زۆر شت دەزانم. دووبارە دەست دەکەمەوە بە خوێندنەوە، چرکەساتێك ئاوڕ دەدەمەوە چەندین کاتژمێر تێپەڕ بووە و هەستم بە تێپەڕینی خۆم نەکردووە بەناو کاتدا. پاشتر کە دەنووسم دەمەوێت گوزارشت لە خۆم و ڕۆحی سەردەمەکەم بکەم، بەتایبەت لەم کاتەدا دووبارە

خەریکە زەمەنی ئیمپراتۆرییەتە کۆنەکانی مێژوو دێتەوە سەر شانۆی سیاسیی و کۆمەڵایەتی، چەرخێکی نوێی هێلینستی لە ئارادایە، دەبێت نووسین گوزارشت لە رۆحی ئەم ساتەوەختە بکات، ئەگەرنا فەلسەفەش وەك پەندی پێشینان دەمێنێتەوە.

خۆم: خوێندنەوە بە تەنها کارێکی زەینیی نییە، بەڵکو جۆرێکیشە لە وەرزش!. هەر لە گەنجییەوە وەك خوویەك لەسەر خوێندنەوە راهاتم. مێردمنداڵ بووم، هێندە جۆش و خرۆشم بۆ خوێندنەوە هەبوو، لولەی گوڵەبەرۆژەم دەکردەوە و دەمخوێندەوە، تەنانەت لاپەڕەی فڕێدراوی سەر شەقامەکانم هەڵدەگرتەوە و دەمخوێندەوە، بۆ ئەوەی ئاگاداربم و بزانم کەسێك بەناوی «سێرڤانتس» چەند سەدە لەوەوبەر، هەمان ئەو کارەی کردووە من دەمکرد. تەنانەت دوو جاریش کتێبم دزیوە، بەڵام شانس یاوەرم نەبوو لە هیچیاندا و ئاشکرا بووم، دوای چەند ساڵ لە رێی خوێندنەوەی بیۆگرافیای نووسەرانەوە گەیشتمە ئەو دەرئەنجامەی دزینی کتێب خووی زۆرینەی نووسەران بووە، تەنانەت یەکێك لە گەورە نووسەرانی ئەمەریکای لاتین کە لە تەمەنی گەنجیدا خاوەن ئەزموونی بەهێزبووە لەدزینی کتێبدا، کتێب دزین بەجۆرێك لە وەرزشیش پێناسە دەکات. ئێستا کە دەنووسم، دژی هەموو شت و لە پێناوی هەموو شتێکدا دەنووسم، ترسم لە هیچ نییە، جگە لەوەی جار جار تووشی هەمان دڵەڕاوکێی «ئۆرهان پامۆك» دەبم، بەوەی ناوبراو ترسی لە بیرکردنی هەیە لە ئایندەدا، بەپێچەوانەی «راسیم جەمیل»ی نووسەری

زەمانی عوسمانییەکان، کە لە کاتی خۆیدا گومناو و پەراوێزخراو بووە، بەڵام لە هەنووکەدا بە جیددی ئاوڕی لێدراوەتەوە وەك نووسەرێکی گەورە و کاریگەر.

من: زۆرجار بیر لەوە دەکەمەوە، موسیکیش دەتوانێت رۆڵی نووسین بگێڕێت، هەر لە منداڵیشمەوە حەزێکی بێسنوورم بۆ فێربوون و گوێگرتن لە موسیك هەبووە، رێکەوتێکی سەیریشە ماڵە هەژارەکەم کەوتۆتە نێوان هەر سێ شەقامی «مۆزارتە شتراسە» و «بیتهۆڤنە شتراسە» و «ڤاگنەرە شتراسە»!. تەنانەت پرۆسەی نووسین جۆرێکە لە ئاواز و موسیك تەنانەت وشەکان وەك هاوروکی موراکامی دەڵێت وەك کلیلەکانی پیانۆ وان هەموو وەك یەکن، هونەرەکە لەوەدایە ئاوازی فرەچەشن لەم کلیلانە دروست بکەیت. بەڵام هەمیشە ئەو پرسیارە لە مێشکمدا دێت و دەچێت، نووسەر کەی دەمرێت؟ ئایا وتەکەی مارگرێت دۆراس راستە کە دەڵێت «من دەنووسم کەواتە نامرم»؟.

خۆم: مەرگی نووسەر ئەو کاتەیە توانای خوڵقاندنی جیهانێکی نەبێت لە رێی تێکستەوە. پرسیارەکە ئەوەیە ئامانجی نووسەران چییە لە خوڵقاندنی ئەو جیهانە تایبەتەی سەر بە ئەزموونی خۆیانە؟.

من: ئامانجم لە نووسین جگە لە پەسنی خۆشەویستی هیچی تر نییە. من بۆ خۆشەویستی دەنووسم.

٢٠١٩-٢-٢٤

کاتژمێر: یەك و چل و چوار خولەك

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

## وتەی داخستن

بیرم لەوە نەدەکردەوە ئەم چەند مۆنۆلۆگە لە کۆتاییدا ببنە کتێب، لە بناغەوە بەشێوەی پچڕ پچڕ و کورت پەرەگرافەکان وەك ستاتوسێك بۆ بڵاوکردنەوە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوك نوسرابوون، پاشتر و بەپێی چەند قۆناغێك بەم شێوەیە گەشەی کرد و رایەڵێکم لە نێوان پەرەگرافەکاندا دۆزییەوە و هەر چەند پەرەگرافێکم پێکەوە لکاند و لە ئاکامدا بوونە بەشێك، بەم جۆرە هەر بیست بەشەکەی ئەم کتێبە لەدایك بوون. نووسینی تێکڕای پەرەگرافە پەرشەکان و دواتریش رێکخستنیان لە فۆرمی ئەم مۆنۆلۆگانەدا لە نەخۆشخانە ئەنجامدراون، تەنانەت نەخۆشخانەی «گلیاد ئاینس» بۆ من بۆتە جێگە و ژینگەیەکی گونجاوی نووسین، ماوەی ئەم چەند ساڵەی دوایش هێندەی لەوێ ماومەتەوە، چارەگی ئەوەم لە ماڵەوە نەگوزەراندووە، دەتوانم لەسەر هەمان شێوەی گرامشی «پەڕاوەکانی زیندان» کە لە زیندانی فاشییەکانەوە فۆرمۆڵەبەندیی چەندان تێزی تێدا کرد، ئەم هەوڵانەی خۆم ناوبنێم «نووسینەکانی نەخۆشخانە» بەو پێیەی لە کاتی رووبەڕووبوونەوەی نەخۆشی شێرپەنجە،

گۆرانیم بۆ ژیان وتووە، لە بری چاوەڕوانی مەرگ، بە باڵای ژیاندا هەڵمداوە و خۆم بۆ ئایندەیەکی روون ئامادەکردووە، نووسینەکانی نەخۆشخانەی من کرۆزانەوەی مرۆڤێك نین، بەڵکو سۆناتایەکن بۆ خۆشەویستی، رەنگە کۆمەڵە شیعری داهاتووشم لە ژێر ناوی «سۆناتای خۆشەویستی» چاپ بکەم.
هەرگیز سکاڵام نەبووە و نیگەران نەبووم لە ژیان. ئادلەر پێیوایە سکاڵا و فرمێسك دوو چەکی کاریگەرن بەدەست مرۆڤی خاوەن گرێی خۆبەکەمزانینەوە، ئەو چەکەش بە «وزەی ئاوی» دەناسێنێت، هەروەك ئەو منداڵە گرینۆکەی بە زەبری فرمێسك بەسەر دایك و باوکیدا زاڵ دەبێت.

رەنگە ئەو پرسیارەش بێتە پێشەوە، چۆن دەبێت کتێبێکی لەم چەشنە، تێیدا ئاماژە نەدرێت بە سەرچاوە؟، لە راستیدا سەرچاوەکان زاکیرەی خۆمن، بە واتایەکی تر لە کاتی خوێندنەوەی کتێبدا کرۆکی مەبەستی نووسەر و ئەو سانتێزە لە مێشکمدا دەچەسپێت نووسەری کتێبەکان تەرحی دەکەن، بەپێی تێپەڕبوونی کات ناوی نووسەر و کتێبەکانیان لە مێشکمدا تەبەخور دەکەن، ئەوەی دەمێنێتەوە ناوەڕۆکی کتێبەکەیە کە وەك رێسا ماتماتیکییەکان لە زەینمدا جێگیر بوون، من سی ساڵ زیاترە خشتەی لێکدانی ژمارەکانم لەبەرە، بەڵام نازانم کێ ئەو رێسا بیرکارییەی داهێناوە! لە پرۆسەی خوێندنەوەشدا هەروام، بۆیە ئەگەر داوای لیستی سەرچاوەکانم لێ بکرێت، زیادەڕەویی نییە بڵێم هەموو ئەو کتێبانەیە لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی رابردوودا

خوێندومنەتەوە، ئەو لیستە زۆر لەوە درێژترە لە کۆتایی کتێبێکدا ئاماژەیان بۆ بکرێت، تەنانەت توێی ئەم کتێبە هەر ئەوەندە پانتایی هەیە ناوی سەرچاوەکانی تێدا بنووسرێت. بە کورتی و کرمانجی ئەم کتێبە بەرهەمی شەونخونی و ماندوبوونی بیست و پێنج ساڵی رەبەقە لە پرۆسەی بیرکردنەوە و خوێندنەوەدا. دەبێت ئاماژەش بۆ ئەوە بکەم لەگەڵ ئەوەی زۆرترین بەرهەمی فەلسەفیم خوێندۆتەوە، بەڵام هەریەك لە مارکس و ئالان بادیۆ و فرۆید، ژێدەری زانین و رێفیرانسی منن لە ژیان و خوێندنەوە و رۆشنبیرییدا.

دەمەوێت جارێکی تر ئاماژەش بۆ ئەوە بکەم، ئەم کتێبە پلانێرەی بۆ نەکرابوو، بەشێوەیەکی خێرا ئەو مۆنۆلۆگانە رێکخران لە توێیدا کە لە ماوەی چوار مانگ و چوار رۆژدا نووسراون، رەنگە خوێنەر هەست بە هەندێك دەمارگیریی فیکریی بکات، بەڵام هیچ کات نامەوێت سازش لەسەر بیروڕام بکەم، نەترساویشم لە درکاندنی روانگەکانم، جارێك بادیۆ لە چاوپێکەوتنێکدا وتی «هەرگیز دەستبەرداری بیروباوەڕی خۆم نەبووم، چوونکە ئەم باوەڕە لەگەڵ زەوقی مۆدەدا ناگونجێت». بۆ منیش بابەتەکە هەر بەهەمان فۆرمە، دەمەوێت بە ئارگۆمێنت بۆم بسەلمێنن بیروڕایەکانم بێ کەڵکن، یان ڤایرۆسێکی کوشندەن، ئەگەرنا کێشەم نییە هەموو جیهان لەسەر رایەك بن و منیش بە تاك و تەنیا لەسەر رایەکی تر. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تر، ئەوەی لە پەرەگرافە پەرشەکاندا و لە مۆنۆلۆگەکاندا تێبینیم کرد بەشێوەیەکی

ئاگاهانە و لاشعوریش باس لە خۆشەویستی دەکەم، بۆیە ئەو گەوهەرەی زیاتر لەهەر شتێك لەم پەڕاوە بچووکەدا دەدرەوشێتەوە باسکردنی خۆشەویستییە. هەرچەند ئەوەی لەسەر خۆشەویستی دەیزانم هەموویم باس نەکردووە، رەنگە ئەگەر بەپێویستی بزانم کتێبێکی تر وەك تەواوکاری ئەم کتێبە بە تەنها لەسەر فەلسەفەی خۆشەویستی بنووسم. نامەوێت ببمە «ئۆشۆ» بەڵام کاتی ئەوە هاتووە ئەو خۆشەویستییە عیرفانییەی بەسەر فەرهەنگی کوردییدا زاڵ بووە تێپەڕێنرێت. ئەو خۆشەویستییەی لە بارەیەوە دەدوێم، نە ئەو ئەخلاقە دەستبازییەی ژیاری خۆرئاوایە، نە ئەو عیرفانە مازۆخییەی رۆژهەڵات، ئەو خۆشەویستییەی لە بارەیەوە دەدوێم دەکەوێتە نێوان هەردوو فۆرمەکەوە.